# بارانی سلێمانی

بەرهەمی بڵاونەکراوە و لە یادکراوی

محەممەد ساڵح دیلان



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی



زنجیرەی ڕۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسەر: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناونیشان:

دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، گەڕەکی ڕاپەڕین، هەولێر

س. پ. ژمارە: ١ تەلەفۆن: ٢٢٣٢٠٢١

شوێنی ئاراس لە تۆڕی ئینتەرنێتدا:

www.araspublisher.com

# بارانی سلێمانی

بەرهەمی بڵاونەکراوە و لە یادکراوی

محەممەد ساڵح دیلان

**ئامادەکردنی: ئومێد ئاشنا**



ناوی کتێب: بارانی سلێمانی- بەرهەمی بڵاونەکراوە و لە یادکراوی
محەممەد ساڵح دیلان
ئامادەکردنی: ئومێد ئاشنا
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ١٠٣
دەرهێنانی هونەری: بەدران ئەحمەد حەبیب
بەرگ: شکار عەفان نەقشبەندی
نووسینی سەر بەرگ: خۆشنووس محەممەد زادە
پیت لێدان: ئەمیر داود
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمان مەحمود
چاپی یەکەم - چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر- ٢٠٠١
لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٤٧٧)ی ساڵی ٢٠٠١ی دراوەتێ

# دیلان

لەڕەوتی نوێکردنەوە و داهێنانەکان لە شیعری کوردی لە پەنجا و شەستەکان و تەنانەت لە حەفتاکانیشدا دوای ناوهێنانی مامۆستا «گۆران» ناوی دیلان لەسەر زاری ناوەندە ئەدەبییەکان و لەسەر ڕووی گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا ئەدرەوشایەوە.

دەتوانین تایبەتمەندی یاخود دەنگی تایبەتی دیلان لەم چەند خاڵەدا دیاری بکەین:

١- مامەڵەکردنی دیلان لەگەڵ وشەدا بەشێوەیەکی تایبەتی وشە کوردیە ڕەسەنەکان.

٢- هەڵبژاردنی جۆری بابەت کە دەبووە هەوێنی شیعرەکانی.

٣- ئەو بەهرە خۆڕسک و سروشتییەی لە خودی دیلاندا هەبوو.

٤- سوودوەرگرتنی لە کەلەپوور و فۆلکلۆری کوردی و ئەدەبی کلاسیکی کوردی.

٥- بەهۆی شارەزاییەوە لە زمانی عەرەبی و فارسیدا سوودی لە ئەدەب و شیعری کلاسیکی و نوێی ئەم دوو نەتەوەیە وەرگرتووە.

٦- شیعرەکانی سالم و مەحوی و حەمدی کاریان تێ کردبوو.

٧- گیانێکی شۆڕشگێڕانە و کوردپەروەری بەرز و خاوێنی هەبوو کە زۆر جار داهێنانە شیعریەکانی بۆ بەرجەستە دەکرد.

بەم جۆرە دیلان بووە دەنگی نوێی قوناغێکی تایبەتی شیعری کوردی.

*ئومێد ئاشنا*

**١٩٩٦/٧/٤**



# دیلان بەقەڵەمی خۆی(١)

من ناوم محەمەد ساڵح کوڕی مەلا ئەحمەد دیلان کوڕی مەلا ساڵح کوڕی مەلا قادری شەوخوێنی کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی مەلا هەمزەیە. بناغەی خێزانی ئێمە یاخود بنەماڵەی ئێمە لەگەڵ دروستکردنی شاری سلێمانیدا لە قەڵاچوالانەوە هاتووینەتە شاری سلێمانی لە گەڕەکی گۆیژە نیشتەجێ بووین. باوکم ناوی مەلا ئەحمەد (دیلان)ە خوێنەوار بوو، بەڵام کاسبکاری ئەکرد، زۆر شەیدای شیعر بوو، هەر چەندە خۆی پێی نەئەوترا شاعیر بەڵام زۆر باش لە شیعر ئەگەیشت. بەتایبەتی شیعری کوردی و شیعری فارسی، چونکی خوێندنی ئەو سایە فارسی بوو لەپاش خەتمی قورئان و ئەلف و بێ تەواو کردن. لە یادمە زۆر کەس لەوانەی کە بەشیعرەوە خەریک بوون ئەگەر شیعرێکی (حافزی شیرازی، سەعدی، نیزامی گەنجەوی)یان لا داخراوبوایە بۆیان لێک نەدرایەتەوە پرسیاریان بەو ئەکرد و ئەیان هێنا بۆ ئەو بۆ ئەوەی بۆیان یەکالا بکاتەوە، تێروپڕ مانایان بۆ لێک بداتەوە. ئەو ئاسمانەی کە من کەوتمە ناوی کە ئێستا باسم کرد یەعنی باوکم و شیعر، باوکم و خوێندەواری کاری تێ کردبووم هەر لە منالیمەوە. دەست پێکردنی خوێندنم ئەگەڕێتەوە بۆ مزگەوتی شێخ بابە عەلی کە لە گەڕەکی خۆمان بوو لە ئەلف و بێ و خەتمی قورئانەوە خەریک بووم و تەواوم کرد لە پاشا چوومە قوتابخانەی خالدیە. قوتابخانەی دەست پێکردنم تەواو کرد چوومە ناوەندی تا سێیم خوێند، سێیم تەواو کرد، گوزەرانی خێزانی ئەوسای (٤٥-٤٦) گران و ناهەموار بوو ناساغیش ڕووی کردە خێزانەکەمان بەتایبەتی باوکم. ناچار وازم لە خوێندن هێنا، لە کۆتایی ساڵی (٤٦-٤٧) دامەزرام بەفەرمانبەر لە دائیرەی انحصاری تووتن لە سلێمانی. تەمەنم لە (١٩) ساڵ تێ نەئەپەڕی، لەپاش ساڵ و نیوێک کە لە فەرمانبەریا مامەوە لە وەزیفە دەرکرام. چەند مانگێک گیرام. درام بەمەجلیس عورفی، حوکم درام، بەربووم، گیرامەوە، حوکم درام بەربووم تا ساڵی ١٩٥٨ یانزە ساڵم بەندی و دوورخستنەوە هەیە. یەعنی گوڵی گەنجی خۆم لەناو بەندیخانەدا بردەسەر. لەپاش ئەوەی کە ڕژێمی پاشایەتی خرا لە ١٩٥٨دا گەڕامەوە بوومەوە بەفەرمانبەر بەڵام ئەمجارە لە دائیرەی تووتن دانەمەزرامەوە، لە دائیرەی ناوخۆیی (الأدارة المحلیة) سلێمانی دامەزرامەوە بووم بەفەرمانبەر (مأمور مخزن) ساڵی ١٩٨٦ خۆم خانەنشین کرد پاش ئەوە بووم بەبەڕێوەبەری تەخطیط وە بەڕێوەبەری قوتابخانە. ئەمە بەکورتی

(١) ئەم یاداشتانەم لە شریتێکی تۆمارکراوەوە وەرگرتووە بەدەنگی (دیلان) خۆی کە بەڕێز کاک (هونەر دیلان) ساڵی ١٩٩٣ پێشکەشی کردین.

ژیانی من بوو لە منالّیمەوە، وەکو فەرمانبەرێک وەکو نیشتمانپەروەرێک، وەکو ئازادیوێک، وەکو ئازارچێژێک لە ڕێی ئەو هۆش و پەیوەستی و پەیوەندی نیشتمانیانەی کە من هەمبوو، بڕواش ناکەم ئێستاش پچرابێ. لەم ماوەیەوە ئەگەڕێمەوە بۆ ساڵی ١٩٥٠ پێش ١٩٥٠ش وەکو بەئێوەی خۆشەویستم وت بەهۆی دەسەڵاتی خوێنەواری باوکم و ئەو دەسەڵاتە تایبەتیەی بەسەر شیعرا هەیبوو، منیش حەزم لە شیعر کرد دەستم دایە نووسین، شیعر بڵاوکردنەوە، لە ڕۆژنامەی (ژین)دا کە لە سلێمانی دەرئەچوو وە هەفتانە بوو. بڕوا ناکەم ئەگەر تەماشای ژمارەکانی بکەن لە (١٩٥٢، ٥٣، ٥٤) ئەگەر لە بەندیخانەشەوە ناردبێتم چربوو، پڕ بوو لە بڵاوکردنەوەی شیعرەکانم، ساڵی ١٩٥٤ بلێسەی بەرز بوونەوەی شیعر بڵاوکردنەوەم بوو، گەڕامەوە دوو کوڕاسی شیعرم بڵاوکردەوە یەکێکیان (شەڕ و ئاشتی) یەکێکیان (کونەبەبووی شەڕ) لە چاپخانەی ژین هەردووکیان چاپکرا. وەک یەتەوە بیرم لە یەک ڕۆژا هەردووکیان نەما هەموو کەس کڕی، گیرا بەدەست خەڵکەوە و نەما، ١٩٥٧ ئەو شیعرانەی کە وتبووم هەموویم کۆکردەوە و پاش کۆچی دوایی سەرۆکی گەورەی نەتەوەی کورد شێخ مەحموودی گەورە بەناوی (شێخ مەحموودی زیندوو) چاپم کرد، هەتا لە ١٩٦٧ چی وترابوو، چی نووسرابوو لە شیعرەکانی تر وە هەمووی کۆکرایەوە و بەناوی (دیلان)ەوە چاپکرا. دراسەی کوردیش یارمەتی چاکی دام بۆ چاپکردنی...

وە نەبێ لە شیعر وەستابم، ئەگەر لە بەندیخانەشدا بووبم شیعرم نووسیوە و بڵاوم کردۆتەوە. ساڵی ١٩٦٩ دووبارە دیوانێکی تازەی شیعرم بڵاوکردەوە بەناوی (پایزی جاران) کە یارمەتیدەرم بۆ ئەمە مامۆستای بەڕێز و خۆشەویست عەبدوڵڵا ئاگرین بوو لە ساڵی ١٩٧٠ و ١٩٧٤ هەتا ئێستا وە نەبێ لە شیعر نووسین وازم هێنابێ. زۆربەی ئەو شیعرانەی کە هەتا ١٩٨٦ وتبووم کە زۆربەی دەستکەوتبێ و کۆکرابێتەوە بەناوی دیوانی شیعرەوە بەڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیری لاوان خۆی لە منی کڕی و چاپی کرد، بەناوی دیوانی شیعرەوە بڵاوکراوەتەوە. وابزانم لە ماوەیەکی نزیکا ئەگەر بتوانم و دەرفەت هەبێ ئەوانەی تر کە دەستم کەوێ کۆی بکەمەوە و، چی وتراوە، تازەش، ئەوانیش بەنامیلکەیەکی تازەی بچووک. چاپی ئەکەین و بڵاو ئەکەینەوە[1].

وەکو یەتەوە یادم لە دانیشتنێکا لەگەڵ خوالێخۆشبوو شاعیری نیشتمانپەروەر فایەق بێکەس کە ئەو بەتەمەنتر بوو، ئەم شیعرانەم بۆ خوێندەوە.

(١) ئەگەرچی دیلان لە ژیانیا بەداخەوە نەیتوانی ئەم کارە بکات. بەڵام من لە ڕێی خزمەتەوە توانیم ئەو ئاواتەی ئەدەبی کوردیان بێنمەدی.



منم بەدەستی چەرخەوە وا گێژ ئەخۆم و ئەڕۆم
منم کە بوومە خوێنەخۆر خوێنی خۆم ئەخۆم
منم لە بەحری خەیاڵاتی بێ وچانی ماتەما
هەر پەل ئەگێڕم نەکەڵک و نەسوود و عیلاجە بۆم

پاش لێبوونەوەی ئەم دوو سێ شیعرە و خوێندنەوەی خوالێخۆشبوو وتی: ئەمە هی کێیە؟ وتم: هی خۆمە، وتی: شتی وا نییە، وتم: ئاخر هی یەکێکی تر بێ ئەتوانم بەناوی خۆمەوە بیخوێنمەوە! وتی: ناچێتە مێشکەوە، ئەمە دەست پێکردنی شیعری من و شیعر بڵاوکردنەوەم بوو.

## وشەی دیلان

وشەی دیلان ئەگەڕێتەوە بۆ باوکم کە (مەلا ئەحمەدی دیلان)ە. کوڕی مەلا ساڵح کوڕی مەلا قادری شەوخوێنە و لە قەڵاچوالانەوە هاتۆتە شاری سلێمانی کە ئەوساتە تازە دروستکراوە و پاشای بابان خانووی بۆ مەلا قادری شەوخوێن دروستکردووە و تا ئێستاش ئەو خانووە کە لە گەڕەکی گاوران و لە کۆڵانی مزگەوتی (بابە عەلی) دایە هەر ماوە. مەلا ئەحمەد بەمناڵی دایکی زۆری خۆش ویستووە لەپێشا پێی وتووە: (دڵ) ئنجا بووە بە(دڵان)، پاشان بووە بە(دلان)، دوا جار بە(دیلان) کە لە دڵەوە هاتووە و مەبەست خۆشەویستییە و منیش نازناوم لەوە جوانتر نەدۆزیەوە و بۆیە دیلانم کرد بەنازناوی خۆم کە ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٤٤. لەوەش بەدواوە کە هەوڵی شیعر و ئەدەبم داوە، چێژ، هێز، هێزی نووسینی شیعر لە شاعیرە گەورەکانەوە گەیشتۆتە هەست و دەماری شیعر نووسینم بەڵام هیچ شاعیرێکم لەسەر خۆم نەکردووە بەماڵ و پەیڕەوی تایبەتی هیچ شاعیرێکم نەکردۆتەوە و ئەوەی بڵاو کراوەتەوە لە ساڵی ١٩٤٩ تا ئێستا (دیلانی)یە نەک لاسایی کردنەوە.

پێویستە شیعر بۆ ئازار و ئێشەکانی میللەت بوترێ. تەماشای گەرووی گەورەی شمشاڵی فرمێسک و خوێن لێ تکاوی شاعیری گەورە (مەولەوی) یان (کوردی) و (سالم) یان (مەحوی) و (نالی) بکەن ئەو ئازار و ئێشانەی کە لە سەدا سەد لەگەڵ مەبەستەکەی مندا جووت ئەبێ، باسی فرمێسکە بۆ ئەو ئازارانەی لە ئینسانەکاندا دیاری ئەدا، واتە دواندن لە ئازاری ئەو خەڵکە، ڕێگە پیشاندانی چاکە و هەنگاونانە بەکۆمەڵ. بەو مانایەی کە ئەبێ پشتی یەکتر گرتن و دەست لەناو دەستنان ڕووی هەرە بەرزی ئەو خەڵکە بێ نەک ڕووکردنە خراپەکاری و دەردی سەری، وەکو لە قەسیدەکانی

مەولەوی و سالم و نالی و مەحویدا زۆر بەئاشکرا دەرئەکەوێ و دوای ئەوانیش پیرەمێرد و بێکەس و گۆران هاتنەکایەوە.

کاروانی شیعری کوردی لە پەرەسەندن و نەبڕانەوە دایە، لە پەنجا بەرەو ژوور قەسیدە و دیوان و نامیلکەی شیعری بڵاوکراوەتەوە و ناویان لێ ناوە شیعر، ئەمەش ڕامان ئەکێشێ بۆ ئەوەی بڵێین شیعر چییە؟ هەروەک لەپێشەوە وتمان شیعر وەک دارێکی بەردار وایە و ئەبێ خزمەت بکات. ئەبێ قافیەی هەبێ، وەزنی هەبێ، مەوزوعێک بێ و ئەنجامێک بدات بەدەستەوە، ئەگەر وا نەبێ وەکو نووسینێک یان پەخشانێکی ئەدەبی بڵاو ئەبێتەوە، لەو بڵاوکراوانەی کە باسمان کردن لە ساڵانی پەنجاوە هەتا ئەگاتە پاش شەست چەند ناوێک ئەبینین وەکو گۆران ، کامەران، لە دوای ئەمانە ناڵێین بڵاوکراوە نەما، بەڵێ هەبوون و بڵاویش کراونەتەوە، بەڵام ئەوانە ناتوانرێ پێیان بوترێ شیعر، جا بۆ ئەوەی کەس نیگەران نەبێ سەرەتا لە خۆمەوە دەست پێ ئەکەم و ئەڵێم چەند بەرهەمێکی ئەدەبیم هەیە وەکو، چیرۆکێ، گوربە، ڕێگای خەبات و هینی کەش کە ئەمانە پێی ناوترێ شیعر چونکە ئەوانە لە ڕاستیدا لە خانەی شیعردا جێگایان نابێتەوە، بەڵکو شێوە پەخشانن، جا وەنەبێ ئەم نموونەیەش لای کەسانی تر نەبێ.

*دیلان*

*١٩٨٩/٤/٢٧ سلێمانی*



## دوا شیعری دیلان(١)

ئەی ژیلەمۆی فرمێسکی سەرگۆنای لۆچ!
لە کێ پرسین؟ خوێن هەڵمژین تاکەی؟ بۆچ؟
من مەلێ بووم، بەرزە فڕی سەردار بووم
گوڵبژێری بەهاری سەرچنار بووم،
خۆشخوانێ بووم وەکو بولبولی بەرەڵڵا
گوللەی کینە بەدوامەوە تێم ئاڵا!
هەتا دارێ لەناو باخا گوڵبەر بێ
خوێنی من و هاوڕێی منی لەسەر بێ!
سنگ شەقارین، لۆچی ڕوومەت داکەوتووین
گوڵ سووتاوین، پشکۆی باخین، هەر سووتووین

١٩٩٠/٩/٢٨

***

## ئازار شکێن(٢)

خەستەخانەی دڵ
شەو درێژە، درێژیی لەبن نایە
کێ شەبەقێ ئەخاتە ئەم دەرگایە
کەی ڕۆشنایی ئەگاتە ئا ئەم لایە
شەو درێژە، درێژی هەر چوار لایە
شەبەق دوورە، گڵۆپەکان بێ شەوقە
شەپۆلی شەو لە گەردندا وەک تەوقە
چاو بڕ ناکا، گلێنەش لەمن ئەوقە
ئاخ، هاتوچۆی سێبەری ڕەش بەزەوقە
بۆ کێ بەرم دەستی چمک ڕاکێشان؟

(١) ئەم شیعرە بەخەتی دیلان خۆی لەلایە. لە کاک (هونەر دیلان)م وەرگرتووە. وە بۆ مامۆستا خوالێخۆشبوو (سەردار کەمال مەولود) وتراوە.

(٢) ئەم شیعرەم لە کاک (هونەر دیلان) وەرگرتووە و بەدەنگی دیلان لەسەر شریت لەلامە.

خۆ دیار نییە ڕێگای دووری کاکێشان!
لەمن ونە کۆڕی گەرمی دەروێشان!
کۆڕەکەی من بوو بەکۆڕی دڵ ئێشان!
سەرم گێژە، سەرینەکەم لاخوارە
ئەو پەڕەوەم بەئاستەمێ لێ دیارە
تەنیشتم کفت، بەورتەیە جار جارە
هەستم خوێنە، سووک خول ئەخوا ئەمجارە
مۆتەکەیەک لەسەر سنگم وەستاوە
هەناسەم قورس بەدوو چنگاڵ گیراوە
چنگێکی تیژ لەبەر بینم خراوە
ئاخ بۆ فوویەک بچێتە قوڕگ لەم لاوە

***

## فریشته

ئەی فریشتە بەم شەوگارە درێژە
تۆ پێم ناڵێی کێ خەریکی نوێژە
ورتەیەک هات وتی کاکە لەمێژە
ئا ئەم کوردە بۆ ڕزگار بوون بوێژە
خۆ هەر تۆ نیت تۆ تەماشای دەوەن کە
سەختی چیا، بەستەڵەک و سەهەن کە
ئەو دڵانەی لەت لەتی ناو چەمەن کە
تۆ ژان و ئێش وەکو ئەوان پەسەند کە
خۆ تۆ لای خۆی بەستەبێژی ئازاری
بولبولێکی باڵ پێکراوی کەناری
هەر دەگەڕێ باخچەی گوڵی بەهاری
تۆ ئاوازی درێژی سەرچناری
تۆ دەنگخۆشی بنەڕەتی ئەم دەردەی
شاخ برووخێ تۆ لەم بناغە بەردەی



لەبن نایەی، تۆ سەرچاوەی ئەم هەردەی
تۆ سروودی نەسراوەی ئەم کوردەی
لێوی چیا سووک بنێرە سەر سنگت
گەڵای بەڕوو بگرە بەهەردوو چنگت
دڵۆپ دڵۆپ بگاتە خوێن ئاورنگت
تێر بمژە دەمی هەڵاڵە و شنگت

***

## ئازار شکێن

ئای چەند خۆشە بەئاستەمێ گوێم لێیە
ئا ئەم دەنگە دەنگی دڵە هی کێیە
ڕێگا چۆڵ کەن، ئازار شکێنی پێیە
دوو ئاوانەی تاڤگەی زەڵمە، یا زێیە
ئەی چارەسەر ئەی موتورفەی ئاسمانی
تۆ ئەم چارەت لە کوێوە بۆ من هانی
تۆ خەیاڵی یا هەناسەی یەزدانی
وا لەپ نەرمی لۆکەی برینی گیانی
ئەی لێو تەنک ئەی پرچ ڕەشە ڕیحانە
چی تۆی هێنا بۆ سەرەوتی ئەم گیانە
کێ پێی وتی سنگ بریندار (دیلان)ە
وەرە پێشێ وادەی ئاخ هەڵکێشانە
وەرە پێشی بەرامبەرم ڕاوەستە
لێت ئەپرسم یەک دوو وشەم مەبەستە
تۆ بۆ دڵت لەگەڵ ئازار پەیوەستە
بەزەییە، ڕێز گرتنە، یا هەستە؟!
پەیمانم بێ لەگەڵ فرمێسکی چاوا
لەگەڵ پرچی ئاڵۆسکاوی تاو تاوا
هەتا شێوەی ئێش بمێنێ لەناوا
شەرتە نەڵێم، هەرگیز نەڵێم ماڵئاوا

١٩٨٧

شکۆفەی ژینی عومرم نەو بەهار بوو (۱)
وەکو پشکۆ لە شەوگارا دیار بوو
تەمەن کورتە وەکو کورتیی گوڵاڵە
لە لێو ئەڕژا بەخوڕ ئەو خوێنە ئاڵە
لە کوێن خوشکان ئێوەن دەشتی ژینم
دەبا سکتان بنێنە جێ سەرینم
بەکۆمەڵ لێو بنێنە سەر هەناسەم
کە ئێوەن کردەم و ئەنجام و تاسەم

***

## چیرۆکی ڕووداوە نەبڕاوەکە(۲)

۱۹۷٤

-۱-

کوێستانەکان،
دەردەداری کەم خوێنی بوو!
ورتەی شەماڵ
لەگەڵگوێچکە، نهێنی بوو!
«شەڕ» زوو هات
«گڕە» سوور بوو
دۆزەخی وەرز
پڕ لە «مۆر» بوو
گەلا
وەکو «سی» سیلاوی
کوناو دەربوو
کەو هەر لە «کەربەلا»ی شاخا

(۱) ئەم شیعرەم بەدەستنووسی لە کاک (هونەر دیلان) وەرگرتووە، ئەم شیعرە بۆ خوالێخۆشبوو نیهایەت عەزیز ئاغا وتراوە.

(۲) گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژمارە (۱۵)، ساڵی سێیەم، کانوونی دووەم ساڵی ۱۹۷٤.



دەنووک و قاچ خەناوی بوو(۱)
«کۆڵوو» گوڵ بوو(۲)
«چاوگ» چڵ بوو
کوێستانەکان
دەردەداری کەم خوێنی بوو
«ترێ» هەر زوو
«ئاڵ و بۆڵ» بوو
هەموو شتێ
لە کوێستانا
ئەهات بەشوێنی زستانا(۳)
«کەو» هەر لە کەربەلای شاخا
چینەکەر بوو
لەناو تۆفانێکی ئاخا
قاسپە تاڵ بوو
تاق تاقکەرە
وشەی زاڵ بوو
«ورچ»(٤) لاواز بوو
قەد باریک بوو
تیشکی ڕۆژی لا تاریک بوو
بێ بۆڵە بوو
ئەوەی لە دەفتەریا نەبوو
ئەنجام سەندنی تۆڵە بوو
ساڵ ساڵێ بوو

(۱) وا دەگێڕنەوە، وەکو ئەفسانەیەک کە (کەو) بۆیە پێ و دەنووکی سوورە چونکە لە خوێنی حەسەن و حوسەین دا لە کەربەلا چینەی کردووە.

(۲) (کۆڵوو) ئەو پەراوێزی نانەیە کە دەسووتێ و دەبێ بەخەڵووز.

(۳) لەبەر نەبوونی لە هاوینیشا گەرمی نەدەبووەوە وە هەموو شتێک ڕووت بوو.

(٤) ورچ: مەبەس لە مرۆڤی ئینتیهازی و مونتەفیعە بێ ئامانجەکانە بەنیسبەت میللەتەوە.

بۆ داگیرکەر
هێرش هێنەر
گەرووی منالێ بوو
نووستووی دەرەو
قەد یالێ بوو
تار
پەراسووی کاکەمەم بوو
دەف
سەرسنگی خاتووزین بوو
پەرداخ
پڕ لە شەرابی ئەسرین بوو
ئاهەنگ
ناشتنی فەرهاد بوو
هەور
دووکەڵ بوو
دووکەڵ هەناسەی کوێستان بوو
سووتاندنی کوردستان بوو

***

## بەشی دووەم[1]

-٢-

کوێستانەکان
دەردەدار بوون
چەند سووڕێ بوو
بێ بەهار بوون
بەو درمەوە گرفتار بوون

(١) بەشی دووەم ڕۆژی کوردستان ژمارە (١٦) شوباتی ١٩٧٤.



لەپڕ!
دووچاری ئازار بوون
چاوی پشکۆی ئەشکەووتەکان
کەوتنە گل
دڵی لە گۆکەوتووی (مله)
هاتەوە (پل)
برژانگی هەڵوەریوی بیر
کەوتەوە مشت
دەرگای شوورە
کرایەوە
مەچەک لە بازنی دۆستی
خرایەوە
تووتی
بەبانگی پڕ قیژەی
هاواری کرد
برایەوە برایەوە
گۆی هونەریش
برایەوە
قارچک[1]
لەپێش وادەی خۆیا
کەوتە بازاڕ
بەهێ پشکووت
هاوین لەگەڵ زستان[2]
جووت بوو «لووت و بزووت»[3]
بەهار زوو هات

(١) مەبەس لە بێ ڕەگی و بێ جێییە کە قارچک هەڵئەتوقێ مەبەستیش لە ئینسانە بێ ئەساسەکانە.

(١، ٢، ٣) مەبەس لە کۆبوونەوەی تناقضات-ە (جمع الاضداد).

نەسرین لەگەڵ لاولاو
بەیەک گەیین
کۆتر بەبەردەمی
بازا ئەهات[١]
بێ گلەیی
چۆپی گیرا
مەشخەڵ
چرای ڕۆن گەرچەک بوو
سەر لە ئێوارێ هەڵکرا
کۆڕ گەرم بوو
چەواڵ نەما
کتێب بوو بەسووتەمەنی
شەو نەرم بوو
تازە تەشپی
ڕێچکەی ئەبەست بۆ سەمەنی
مام سمۆرەش
ئەو ڕەسەنە
دەست و پەنجە و پێ
بەخەنە
زیت، زیت ئەبلەق
ئەیروانیە
ئەم دیمەنە
سەر سوڕما بوو
تیا وەستابوو
سەرنج ئەدا
کوێ هێجگار
کووڕ و هەورازە

(١) مەبەس لە کۆبوونەوەی تناقضات-ە (جمع الاضداد).



بۆ خاوەن بیر
ئەوی ڕێڕەو و ڕێبازە
فریشتەکان
قەل فڕ کران
تەرەو ڕووەو دۆزەخ بران
قەڵەم
ورد بوو درشت کرا
لاپەڕە بێ بڕشت کرا
سەرنج ئەدا
ڕێگا زۆر سەخت و هەورازە
کەچی بێ باک
ملی شیعر
خراوەتە ژێر قەرازە
گەردنی تیپ
بەبێ کێشە و بێ چەڵەمە
نراوەتە ژێر کەڵەمە

***

## بەشی سێیەم[١]

-٣-

سەرنج ئەدا
دڕکەزی و (کەڵەوێ)[٢]
بەبار
چەمۆڵە
لە نارنج ئەنێ!

(١) بەشی سێیەم ڕۆژی کوردستان ژمارە (١٧، ١٨) حوزەیران تەموزی ١٩٧٤.
(٢) کەڵەوێ: دڕکێکی ئازاردەرە.

هەر «گەوونە»[١] و
قەتار قەتار
موتوربە
لە ترنج ئەنێ
تاجی ئاوریشمی
پەری
لەسەر سەری
درنج ئەنێ
دەست و بازووی
دژی بەهار
«پێمەرە»[٢] وا لە بنج ئەنێ!!
ئەی فریشتە
دەرگا ،
هەمووی لەسەر پشتە
بۆ پەلەوەر
بۆ باڵندە
بۆ سەرکەوتوو ڕووەو کوێستان
بۆ ڕافڕاو بەرەو گەرمیان
تەنیا
تاکە مەلێ نەبێ
لەم سروشتە
دەرگای بەندی
لەسەر پشتە
لەسەر خوێندن لەسەر «بەستە»
ئەویش «بولبولی سەرمەستە»

(١) گەوون: دڕترین دڕکە، کەتیرەی لێ دەردێ.
(٢) پێمەرە: پاچ.



بۆ گوڵ خوێندی
قەفەس کرا
بۆ ئەم چڵ و ئەو چڵ
وتی
لەم لاو ئەو لاوە
بەس کرا
بۆ باخ فەرمووی
بۆ داخ فەرمووی
کۆت و زنجیر
لە دەس کرا!.
بەڵام خوێندی
هەر ئەشخوێنێ
هەتا کوێستان
ڕەنگ و ڕووی
جاران هەڵدێنێ
هەتا کوێستان
زەردی
لە چاوا نامێنێ
هەتا کوێستان
دڵۆپی
فرمێسکی یاقوت
بەسەر
سەیوانا ئەڕژێنێ
تا کوردستان
تۆڵە لە چەرخ،
ئەستێنێ.

***

## بۆ هەڵەبجە(١)

ئەی گوڵاڵەی خوێن لێ تکاوی نیسان
ئاودراوی بەجۆگەی خوێنی گریان
لەناو گۆڕا چریسکەی دێت برینم
مەشخەڵێکە بۆ ڕۆژگاری ژینم
لەگەڵتان بووم نەسووتاوم، ئێستە پشکۆم
خەمی ئێوە و خەمی خۆم گرتە ئەستۆم
ئەگەر دووکەڵ هەناسەم بێت بەخوێناو
ئەچنم تۆڕی ئازارم بەدێراو
هەتا ئەپوێت دەمار و ئێسقانم
بەقوربانی بچووک و گەورەتانم

١٩٨٨/٤/٢٢

***

## بۆ نەهرۆی حەسەن فەرەج(٢)

من تنۆکی خوێنی سووری ئەم شاخەم
پەڕەی گوڵی هەڵوەریوی ئەم باخەم
من سووراوی لێوی ئاڵی سەیوانم
نەو گوڵاڵەی هەتاوگازی کوێستانم
من توێژاڵی برینی ئەم وڵاتەم
ئەرخەوانی تازە چرۆی ئەم کاتەم
«من ڕێبواری ڕێگایەکی گڕاویم(٣)
تەمەن کورتی ژیانێکی خوێناویم
خوێن ڕژاوی بەستەی سووری ژیانم
زوو هەڵفڕی مەلی جەستەی گیانم

(١) ئەم شیعرەم بەدەستنووس لە کاک (هونەر دیلان) وەرگرتووە.
(٢) ئەم شیعرەم بەدەستنووس لە کاک (هونەر دیلان) وەرگرتووە.
(٣) ئەم شیعرەم بەدەستنووس لە کاک (هونەر دیلان) وەرگرتووە.



شینی بەستەی بەسەرهاتی گوڵباخم
هەڵوەریوی بێ ڕەشەبام لە باخم
ئازار دیون کەسوکارم بەکۆمەڵ
ئاخ بۆ فرمێسک خوڕ بڕژێ بەتۆپەڵ»

***

## بۆ شەهید نوری حەمە عەلی(١)

برینم ئاگرە شاڵاوە خوێنم
سەرینم پڕ لە پشکۆیە شوێنم
لە ڕووی ڕۆژا بەبەرگی ئەرخەوانی
لە توێی نووسراوە نووریم هەر ئەمێنم
ئەمێنم چونکە ڕۆڵەی سووری پشکۆم
برووسکەی ئاڵ و واڵای دەوری ئاسۆم
لەناو دڵدام لەناو خوێن و دەمارام
هەتا کوردێ بمێنێ من لە شارام

***

## من و بای شەماڵ(٢)

هەرچەند بەگران لە بای شەماڵ ئەگەم
ئەو شنە و منیش ناڵە ناڵ ئەکەم
بەڵام بای شەماڵ بۆی گێڕامەوە
ئەو وتی ورد ورد من گەشامەوە
وتی ئەوەتەی دنیا دنیایە
کۆن ئەڕوا تازە و نوێ دێتە کایە
لەپێشان بازووی بەهێز و قایم
زاڵی لاواز بوو هەمیشە و دایم

(١) ئەم شیعرەم بەدەستنووس لە کاک (هونەر دیلان) وەرگرتووە.
(٢) گۆڤاری ڕزگاری ژمارە (٥)ساڵی یەکەم ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٦٩.

ئینجا هەر زاڵی و دەست و پێوەندی
خۆی و نۆکەر و گورز و کەمەندی
هەڵپە و پەلامار بۆ دەور و پشتی
چی بەردەست ئەکەوت بۆ قوڵی مشتی
پاشان بیری خەڵک بەرەو بەرزبەتی
بروزی ئەسەن رووەو ژیریتی
زاڵی تازەشمان بەگوێرەی وەختی
ڕێ و شوێنی تازە لە دەوری تەختی
وازی لە شێوەی جاران ئەهێنا
پەت و سێدارە و گوللە لە شوێنا
نەک پێست گوروون و یاخۆ سووتاندن
بۆ ئەوەی بڵێ ژیان نەک مردن
من وام بیستووە وام دیوە بەچاو
سا هەچ زاڵمێ هاتبێتە ناو
پاش دەرکەوتنی کردار و پیشەی
دەریان ئەهێنا دەمار و ریشەی
تۆز و ئێسقانی ئەدرا بەبا
سا خۆی و شیری با بۆ کوێی ئەبا
بڕوانە مێژوو ئەگەر ئەتەوێ
ڕاستی وتەمت بۆ دەرئەکەوێ
ئەوە هۆلاکۆ، هیتلەر، نیرون، چار
ڕۆین چوونەوە وەک بەفرەکەی پار
ئێستاش هەر وایە قانوونی ساکار
ئەوی خوێنخۆر بێ و زاڵم و بەدکار
ئەوی بیەوێ شەڕ هەڵگیرسێنێ
ماڵ و منداڵی خەڵک بسووتێنێ
خانەی بێ دەنگی خەڵکی دابێژێ
خوێنی پیرۆزی ئینسان بڕێژێ



هەروەکو باوکی باپیری کۆنی
چی لێ هات ئەویش ئەوێیە شوێنی!

***

لەسەر کێلم بەبۆیەی سوور بنووسن خۆشەویستانم(١)
لەناو گۆڕا لەژێر خاکا، لە ڕیزی دەست لە دەستانم
بەپەیمانێ کە من دابووم بەکورد و خاکی کوردستان
بەنەعرەی ڕاپەڕین شەرتە کە بانگ کا من لە هەستانم

***

## گوڵی ئاوات(٢، ٣)

ئەی گوڵی ئاوات، گەشەت بێ و پێکەنە
نەختێ نرخ و فەڕ بدە بەم چیمەنە
گیان پەرۆشی بۆنی ئێوارانتە
سەر پەرێشانی پیاڵەی گوڵشەنە
بۆ مژی جامی لە با لەب ئاڵتە
لێوی ناسۆرم بەبار و وشکەنە
بۆ کزوسیس و لوول و بێ گەشەی
ڕیشەیی تۆرا و تاڵیت هەڵکەنە
کوا لە کوێیە بولبولی سەوداسەرت
بۆچی بێ ئاواز و سۆزی دەگمەنە

***

گوڵ وتی ئاسمانی پاکی نیشتمان
پڕ تەم و هەوری بەد و ناڕەسەنە
وا لەژێر تینی گڕی داگیرکەرا
هەردەیی ڕەنگینی خاکم ڕووتەنە

(١) ئەم شیعرەم بەدەستنووس لە کاک (هونەر دیلان) وەرگرتووە.
(٢) گۆڤاری ڕزگاری ژمارە (١) ساڵی یەک (٢٠)ی نیسانی ١٩٦٩.
(٣) یەکەمجار لە ڕۆژنامەی (ژین)ی ژمارە (١١٦١)ی ساڵی ١٩٥٣دا بلاوی کردۆتەوە.

وا له جێگای ساز وناڵینی کەمان
هەر زرەی زنجیر و زرمەی پێوەنە
سەیری پەنجەی دوژمنی تینوو بەخوێن
نەو گوڵی لاوان ئەکاتە دەسکەنە
من ئەڵێم ئەی گوڵ گەشەت بێ و پێکەنە
نەختێ نرخ و فەڕ بدە بەم چیمەنە
پێکەنە خوێنی ڕژاوی میللەتم
با لەپێ بگرێ ئەوی لێم دوشمنە
پێکەنە ئەمڕۆ لە جێگەی دەست و پێ
بۆ قەفی زنجیری دوشمن گەردەنە
وا بەخوێنی ئاڵی بێگەردی شەهید
شەو ئەڵێی ڕۆژی ڕەوان و ڕەوشەنە
پێکەنە وا تیشکی ڕۆژی ڕاپەڕین
هەر لەسەر لووتکە هەتاکو دامەنە
تۆ تەماشا بەردی دەستی میللەتم
بۆ سەری ماری ڕژێمی بۆگەنە
سەیری کۆسپی ڕێگری ڕێگەی خەبات
جێگە پاچی میللەت و لووتی شەنە
پێکەنە ئەی گوڵ ئەوا ئاسۆی نەجات
خۆ بەخوێنی ڕۆڵەکانمان ئەڵوەنە
مۆژدەبێ هەر ها کە ناقووسی بەیان
دەنگ و ئاوازی گەیی بەم مەڵبەنە

١٩٥٣

***

لە سەرەتاکانی[١] ساڵی ١٩٦٠دا هەندێ لە برادەرانی پێشەوەی خەباتی سیاسی ئەوسایە پەیوەندیان بە دیلانەوە کرد لەوانە کاک نوری ئەحمەد تەها، چوونە لای خوالێخۆشبوو (مەحموود ئەحمەد)ی چیرۆکنووس کە یەکێک بوو لە کادرە پێشکەوتووەکانی حزبی شیوعی. کاک نوری باسی لەوە ئەکرد کە گوایە برایانی پارتی



ئەیانەوێ شۆڕش هەڵگیرسێنن بەرامبەر بەڕژێمی عەبدولکەریم قاسم. کاک مەحموود قسەکانی کاک نوری زۆر لا پەسەند ئەبێ لەو کاتەشدا کاک مەحموود لە جێگادا کەوتبوو وە نەخۆش بوو. وەڵامی کاک مەحموود ئەوە بووە وتبووی (ئەگەر شۆڕش ئەکەن با شۆڕشەکە شۆڕشی کورد بێ بەپارتی و شیوعی و عەشائیر و هەموو کوردەوە، چونکە ئەمە ئاواتی هەموو لایەک دێنێتەدی. بەڵام ئەترسم بەم ئاواتە نەگەم و هەتا ئەمرم خەوی پێوە ببینم!). دوای کۆچی دوایی مامۆستا (مەحموود ئەحمەد) شۆڕش لە هەموو لایەک هەڵدەگیرسێ و شۆڕشی ئەیلول پەرەئەستێنێ. ئەوساش دیلان ڕوو ئەکاتە خوالێخۆشبوو مەحموود ئەحمەد ئەڵێ:

دێتە گوێم، دەنگێک ئەگاتە گۆڕی تەنگ و تارەوە[٢]
پێم ئەڵێ مەحموود لە ڕۆژی کۆچی دوایی پارەوە
ئەو خەوەی ئاواتی تۆ بوو دێتە بەرهەم ئێستە وا
مەشخەڵە بۆ شەو لە سایەی ڕۆڵەی وشیارەوە

١٩٦٩

***

## زستانی ئاڵ[٣]

دڵ ئەسووتێ، مەشخەڵێکە گڕ گرتوو
وەکو پووشی خەرمانی بەر با کەوتوو
پاشماوەکەی چەواڵێکە بێ سووتوو
کانی خوێنە، لەبن نایە وەک مردوو

***

ڕوو لە کوێ کەین؟ کوێ بەرینە بۆ ڕاوێژ
بێ کرمەیە، بێ خرمەیە، کاتی چێژ
هیچ نایگاتێ نەک تفەنگی تۆپ هاوێژ
چاو خۆڵ ئەخوا بە چوار لایا! گێژ و وێژ

***

(١، ٢) ئەم پێشەکی و شیعرەم بەدەست نووس لە کاک (هونەر دیلان) وەرگرتووە.
(٣) ئەم شیعرەم لە شریتێکەوە وەرگرتووە بەدەنگی دیلان خۆی و ئێستا لەلامە وە لە کاک (هونەر دیلان)م وەرگرتووە.

بەرەو (کۆتەڵ) ڕازی تازەی زستانە
لێو ڕەنگکردن جامخانەکەی (دوکان)ە
هەنار لقی بەسەر سنگا پەخشانە
ئاخ شاخەکان دەست و پەنجەی سەر شانە!

***

دەنکی هەنار وەک دڵۆپی گریانە
لەرەی سنگە زڕەی دەست و فنجانە
دڵ ئەسمرێ، تیر هاوێژیش چاوانە
ڕوو لە کوێ کەین؟ تێشووی ڕێمان فرمێسکە
توێشەبەرەی جەواڵێکی پڕ ئێسکە
دڵ هەڵگیرسا پشکۆی زێری تامێکە
گورج لێ ئەدا، خێرا خێرا وەک نێکە

***

زستانی ئاڵ، کێ هاوڕاز و هاوڕێیە
کێ بەرهەمی جێ چنگی کۆنی پێیە
کێ دەماری نەک خلیچکە وەک زێیە
ڕێگا بڕە کەمەر توندە بەپێیە

***

کێ هاوڕازە، هاو نیازە، هاو دەردە؟
کوڕی شەوە ڕۆڵەی ڕۆژە نەبەردە
گڕ گرتووە نەک سووتاوە وەک بەردە
پشکۆ خۆرە، ئاگر هارە، هام فەردە

***

کێ شین پۆشە، شەوە بەرگە، داماوە
جگەر ونە، ئێسقانی داکرماوە
سپێنەی چاو جۆگەی خوێنی تێ زاوە
هاوڕێی منە، بێتە پێشێ بەم لاوە

***



کێ هاوشانە، هاو شەقاوە، سنگ پانە
پێست ئەستوورە بۆ لێقەومان قەڵغانە
بیری تیژە وەک نەشتەری دەبانە
هاوڕێی منە، دەم بنێتە ئەم گیانە

***

زستانی ئاڵ، زستانی ئاڵ، کرێوە
دای پۆشیوە، ئەو بەردانە، ئەو کێوە
بەفرماڵ کوا؟ بۆ ڕێ بڕان لەو چێوە
کوێ بەرزیە، ئامێتەیە، نشێوە

***

سەر دەرکردن لەلای هەندێ پرسارە
سەربەرزێتی ژان هێنەرە جەخارە
گوێ ئاخنین بارانی ژێر دەوارە
لرف لێدان، کراوەیە بەبارە

***

ئەی تیشکی ڕۆژ، وەی زەردەی شاخەکانم
خۆ من کوردم، هەر هیچ نەبێ ئینسانم
چاو کراوەی گوڵاڵەی گردەکانم
پەیمان بێ، یا گیان یا نیشتمانم

١٩٨٨

***

## بەستەی دڵ(١)

بۆم بخوێنە، ئەی بولبولی ئاوارە
بەستەی دڵی، سەرمەست و گەشکەدارە
بەستەی دڵی، پڕ هەست و پڕ تریقە
مەستی کاتی، لە هاویندا بەهارە
بەستەی کاتی چیمەن بەفەڕ بەشەوقە

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١٤٠٤) ١٩٥٨/٨/١٤.

ئاسمان بووک و ئاوێنەکەی نزارە
مەستی کاتی، شادی ئاڵ و ڕازاوە
«گور» کراوەی هەڵلووشینی ئازارە
مەستی کاتی، چرۆی نیازی چەندساڵە
ئێستە گوڵە و ئەو خۆی خاوەن گوفتارە
مەستی کاتی، «برین» دەمەو ئەجۆشێ
نەک بۆ تۆڵە، بۆ کرداری بێ دارە
برین دەمە و دەمیش پڕ لە هاوارە
ئەڵێ ئیمڕۆ گەل کارەکەی بەردارە
قوربانتان بم، سەرکەوتن زۆر گرنگە
گرنگتر لەو «پاراستنی» دژوارە
با توولە مار لەژێر پێدا هەپروون بێ
بەڵام لەوبەر زیتەی چاوی ڕەشمارە
زیتەی چاو و تیژ کردنی ددانە
کلکە لەقێ و مرەی مام ئیستعمارە
بۆم بخوێنە ئەی بولبولی ئاوارە
بەستەی دڵی سەرمەست و گەشکەدارە
بەستەیەک بێ پشوویەک با بەجەستە
بەو لەشانەی بریندار و زامارە
بیدا بەگەل بەخاک و نیشتمانی
بەکوردستان بەم مەرزە خۆش گەوارە
بەستەیەک بێ گوێ پڕ بکا لە ورشە
بڵێ شادی لە جێی نووکی جەخارە
بڵێ لەجێی پەت و داری قەنارە
وا ناشتنی چنار و دار هەنارە
بڵێ لەجێی دەردی سەری و بێ کاری
مێرگی ئێش و هەڵبەستی ڕووپارە
بڵێ لەجێی چەرمەسەری و بێزاری



شادمانی و کامەرانی ڕێبوارە
بڵێ لەجێی بێ بڕوایی و ناکۆکی
کاروانەکەی یەکگرتنە قەتارە
بەستەیەک بێ ئەم خەڵکە هەڵسەنگێنێ
دوورە پەرێز ڕابگرێ بێ کارە
بەستەیەک بێ بڵێ وەتەن سەربەستە
گەلیش ئەوا ئازاد و بەختیارە

١٩٥٨

***

## دەردی دڵ، دڵی سەوزم[١]

دەردی دڵ نووزە درێژێکە کە من دەیزانم
داستانێکی چی گێژێکە کە من دەیزانم
شۆری گڕ بادەو و پەیمانە لە مێشک
سۆز و ئاوازی چی بوێژێکە کە من دەیزانم
توێخی ئەژنۆ چوون و ئانیشکی نزا
مەرج و پێویستی چ نوێژێکە کە من دەیزانم
کێ تەریکە لە دڵ و پشت لە دڵە
خاوەنی ڕستی چی کاوێژێکە کە من دەیزانم

***

دڵی سەوزم لە زەردی تۆ دەلەرزێ
لە ساردی تۆ گەرم بۆ تۆ دەلەرزێ
لە دووریتا وەکو ئاهوویی گیراو
لەناو داوا بەهۆ و بێ هۆ دەلەرزێ
لەبەردەمتا لە کاتی تێپەڕینا
وەکو مووێک نزیک پشکۆ دەلەرزێ
وەک ئەو ئێوارەیەی مانگ کەوتە خوارێ

(١) ئەم شیعرەم لە کاک (هونەر دیلان) وەرگرتووە.

وەکو پەردەی دەمی ئاسۆ دەلەرزێ
دڵم خوێنە، گوڵە ئەندام و جەستەت
بەخوێنی دڵ وەکو شەوبۆ دەلەرزێ

١٩٧٦ سلێمانی

***

## جانەوەری شەڕ[١]

بۆ وڵات ببێ بەدەریای خوێناو؟
مردن ببارێ بەگژم و بەتاو!
ڕەش دابگیرسێ ئاسمانی شینم!
وشک هەڵبگەڕێ دەشتی ڕەنگینم!
زەردباو بنوێنێ پەڕەی گوڵاڵەم!
لێم تاریکتر بێ ئەم ژینە تاڵەم!
بۆ بەبێ تیشکی ڕۆژی بەهارم!
بتاوێتەوە بەفری نزارم!
بڕۆخێ لانەی بولبولەکانم!
تێک بچێ خوڕەی سەرچاوەکانم!
بۆ سوور بنوێنێ تریفەی مانگم!
نقوم بێ دەنگ و ئاواز و بانگم!
بەبێ پایز و زەردی خەزانم!
بوەرێ گەڵای درەختەکانم!
لەجێی سروودی مەلی سەردارم
بایەقوش بێتە یار و غەمخوارم
بۆ ماڵ بڕوخێ شار هەرەس بێنێ؟
بێ ئاگر و نەوت کڵپە بسێنێ
بۆ گرد دروست بێ لە ئێسکی سووتاو؟
لە لەش و لەسەر لە گۆشتی برژاو

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١١٢٢) ٦ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٥٢.



لە مەچەک لە قاچ لە دەستی پەڕیو
لە پرچ لە گۆنا لە پێستی ڕزیو!
بۆ سەر یەک کەوێ لاشە مردوان!
کەڵەک بێ هەتا ئەگاتە ئاسمان
هەرچی بەرەنج و بەئارەق ڕێژان
هاتۆتە بەرهەم لە مێژووی ئینسان
تەفروتوونا بن تێکڕا نەمێنن
سەرلەنوێ تۆوی دیلی بچێنن
بۆ خێزان، ژنان، کەفتەکەناران
پێ پەتی، لەش ڕووت، وێڵ و سەرگەردان
ئاوارەی چۆڵ و ڕێی تووناوتوون بن
لەژێر بۆمبادا سەرەونگوون بن
بۆ قوتابخانە و کۆشک و تەلاران
ببنە خەڵووزی کوورەی بەدکاران
بۆ؟ بۆچی؟ بۆکێ؟ ئەم بەڵای ڕەشە!
لەبەر کێ بڕژێ ئەم خوێنە گەشە
لەبەر زەوتکەری ئەم خاک و سەروەتمان
هۆی دەردی سەر بوو بەختی نەگبەتمان
هۆی ئازاردان و چەوساندنەوە
هۆی خوێن مژین و ڕووتاندنەوە
زنجیری زل و پێوەندی پێمان
کۆسپی بەرلووت و چقڵی ڕێمان
بەتاڵان بەری هەبوو نەبوومان
شیشی داخ بۆ ناو ئێسکی زیندوومان
بەکورتی لەبەر ئەمپریالیزم
خوای دەرەبەگی و باوکی فاشیزم
هەر لەبەر چاوی ڕەشی زۆرداران
لەبەر خوێنمژان یا گوناهکاران

نەء نەخێر ئیمرۆ میللەتان یەکسەر
ڕێگای ئاشتییان وا گرتۆتە بەر
میللەتی ئیمرۆ هی دوێنێ نییە
ئەزانێ شەڕ و شەڕخواهی چییە
زۆر چاک ئەزانێ دوژمنی کێیە
کێ شەڕی ئەوێ کێ مژدەی پێیە

***

## پاییز(١)

پارچەیەکی (ڕەمز)ییە
١٩٥٣

پاییز بوەرێ گەڵای درەخت
زستان، با بێنێ وەیشوومەی سەخت
خەزان، با زەرد بێ دەشت و چیا و کێو
بەفر، داپۆشە هەوراز و نشێو
ڕەهێڵە ڕای دەپووشی پەنا چاڵ
بای وەشت، بیشکێنە نەمامی ناوماڵ
دووکەڵ زەردی کە ژوور و قوژبنان
داپۆشە چارەی جگەر کون کونان!
پەپووە ڕۆژتە بخوێنە بەگەرم
سەرماوسۆڵەیە لە کەس نەکەی شەرم
بەڵام با ببیەی ڕازی داستانی
یەتە پێش چاوت ناوی نیشانی
تا پاییز تارای زەردی نەپۆشێ
زستان وەیشوومەی سەختی نەجۆشێ
وشک نەبێ پووشی دەشت و چیا و چۆڵ

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١١٣٢) ساڵی ١٩٥٣ هەروەها گۆڤاری ڕزگاری ژمارە (٤) ساڵی یەکەم ١٨ی ئایاری ١٩٦٩.



نەیگری بەفر لوتکە و شێو و دۆڵ
لافاو و باران نەیماڵی زەوی
بای دەشتیش نەیبا پەرژینی قەوی
لرفە و چۆقەی دان نەگاتە ئاسمان
پەپوو نەخوێنی لە پۆپی داران
چۆن ڕۆژی بەهار ئەدا گزنگی؟
دەر ئەخا تارای سووری گوڵڕەنگی
چۆن نێرگس چین چین خاو خاو ئامێزان
نازداران پۆل پۆل گوڵاڵە ڕێزان!
ئەدەن بەیەکدا دەس لەناو دەستا
لەگەڵ گوڵاڵەی سووری چاومەستا
چۆن یەتەوە قوڵ سەرچاوەی بنار؟
گیای ناو ئاو ورد ورد ئەخاتە کەنار!
چۆن یەتە چرۆ درەختی باخان
یەتە، بریقە، نزاری شاخان

***

## هەورەکە، دایرێژە(١)

هەورەکە دایرێژە،سا، شەستی بارانت
با، بیبا، سەیلانت، دێهات و شارانم
با گڕی تریشقەت، چەخماخەت، بروسکەت
گیان بکا بەخەڵووز نەیهێڵێ تووسکەم
با، ڕەشیت، تووڕەییت، با شێوەی ئاڵۆزت
ونی کا ئاوازی هێلانەی بەسۆزم
با لێزمەی بەخوڕت یا تاوت یا تەرزەت
بیکوتێ، بیشکێنێ، قەڵەم کا بەتەرزم
با تەمی سەر لوتکە و سەر شاخی زۆر تاڵت

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١١٥١) ساڵی ١٩٥٣.

دایپۆشێ دیمەنی نزاری خاڵ خاڵم
هەورەکە دایڕێژە سا شەستی بارانت
با بیبا سەیلانت دێهات و شارانم

***

هەورەکە چۆک دادە و تەپونم داڕێژە
چین چینی شەست پەڕ وەنەوشە دابێژە
«پەیمانە»ی سەردەستی گوڵاڵە بڕێژە
تۆش، (قوڕاو) لە چاڵ و لە چۆڵا بنێژە

***

با دەعبای خزاوی بن میچ و لە کون چوو
تۆقیوی ڕۆشنایی، ملکەچ و گیان مردوو
چاو کوێری گەشەی (گوڵ)، هەڵاتووی بریقە
ڕەفیقی هەنسک و سەرشۆڕی تریقە

***

ئەوانەی کە تۆ (هۆ)ی بۆ گەشتی ئاسمانیان
بۆ خشپە و بۆ چرپە و بۆ گۆشەی ئامانیان
دەرکەون (تۆ) بەری ڕۆژت وا لێ گرتوون
تۆ هێز و توانای فڕینت بۆ بردوون!

***

بەڵام تۆ، هەورەکە لە یەک دە و تاریک کە
دەزوولەی ڕووناکیم زۆرتریش باریک کە
هەر کاتێ هەڵی کرد بای بەهێز بای لە پڕ
بەسنگی ئەستوورت بەجۆرێ ئەدا دڕ
هەر پەڵەت، هەر پارچەت وا ئەبا بۆ شوێنێ!
نەدەنگت، نەڕەنگت شێوەشی نەمێنێ!

***

ئەی هەوری داگیرکەر تۆزێ بۆم ڕاوەستە
کەمەری تاریکیت باشتریش ببەستە



هەر کاتێ هەڵی کرد بای تۆڵەی گەلی من
تۆ خۆتو دەعباکان جێ نابێ تێ بچن

***

## مژدەی مەلێک[(١)]

مناڵ:
ئەی باڵداری، دەنووک سوور
بریقەت دێ، دوور بەدوور
ئێسک سووکی نەرم و شل
دڵ دێنێتە جووڵە و پل
وەرە لە توێی دەسرازە
لە تووکی نەرم و تازە
لە سنگی گەرم و گوڕم
لە چاوی هیوا پڕم
بۆت ساز ئەدەم هێلانە
ئەی مەلی خنجیلانە
وەرە من بەپەرۆشم
من بێشکە و لەش و کۆشم
خۆشە بۆ هەڵنیشتنت
بۆ جێی ئارام گرتنت
کۆتر:
کۆرپەی نازکتر لە گوڵ
سەودای جوانی پڕ بەدڵ
منیش گڕی ئاسمانم
چریسکەی باڵەکانم
ملەقوتێی گوێسوانەم
هاقی دەمی کولانەم

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١١٥٣) ٢٥ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٣.

لایلایەیە بۆ خەوت
بۆ پرخەی ڕۆژ و شەوت
بنوو بێ ترس و بێ سڵ
ئەی خونچەی گەشی سەرچڵ
منالّ:
ئەی باڵداری دەستەمۆ
خودای لەنجە و هاتوچۆ
چییە بەدەنووکتەوە
بەسەر پەڕی سووکتەوە
دە بیخەرە ناو چنگم
بیدە لە یەخە و سنگم
چونکە بەخوێن تینووان
وەک مار بەسەر زینووان
داگیرکاری بێگانە
وا خەریکی پیلانە
خەریکی خوێن ڕشتنن
تەمای وێران کردنن
وەرە من شەڕم ناوێ
بم لاوێنە تاو تاوێ
من بەئاشتی و ژینی شەنگ
دوور لە بۆمبا و گڕی جەنگ
وەک گوڵ ئەگەشێمەوە
وەک بووک ئەڕازێمەوە
کۆتر:
کۆرپەی شیرین گروگاڵ
ئەوا لەگەڵ بای شەماڵ
بۆم هێنای مژدە و دیاری
دەس کە، بە خنە و یاری



ئەوا هەموو میللەتان
کەوتوونە ڕێی تێکۆشان
ئاشتیت بۆ ئەپارێزن
شەڕ و شەڕخوا ئەبێزن
وا یەک دەس و بەیەک دەنگ
ئەڵێن! «نامانەوێ جەنگ»
ها ئەوەش لقی زەیتوون
هەستە بەبێ چەن و چوون
بەگاگوڵکێ نەرم و ورد
بیدە، دەس نەتەوەی کورد
بڵێ ئێمەش وەک گەلان
بەهاوکاری و تێکۆشان
ئەگەینە مافی خۆمان

١٩٥٣

***

## بۆ گیانی برایەکم(١)

١٩٥٣

ئەی ئاوارە لە دەس ماری بێگانە
تۆ پاکیت و نەبەزینت نیشانە
تۆ، کۆڵ نەدانت و لانەدان لە ڕێگات
بوو بەدڕکی تێ هەڵچەقیوی جێگات
تۆ، خۆبەختیت، بیرکردنەوەت لە سبەی
هاویشتیتیە باوەشی سزا و ناڵەی

***

ئەی بولبولی سەودای گوڵی ئازادی
تۆ بۆ ڕۆژی خۆشبەختی و شادی

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١١٥٩) ساڵی ١٩٥٣.

خۆتت گیرا لە دەوری ئامانجی گەش
لەگەڵ ئازار و ئێشا بوویتە هاوبەش
تۆ بەڕووتی، دەردی سەری، نەخۆشی
بۆ هیوایە، ئاواتێ، تێ ئەکۆشی
تێکۆشانێ دەنگی زنجیر بێ سازت
تێهەڵچوونی مڕەی دوژمن بێ ڕازت
ئەی چریکەی بێ دەنگی نووکی خامە
دوژمن گێژە و خەیاڵ و هۆشی خامە
نەتوانیویە و نەئەتوانێ، تۆ و هاوڕێت
ئاشی ترسی ئەو بیرەتان بهاڕێت
نەتوانیویە و نەئەتوانێ، زنجیری
داوی ڕەشی فاقە و کەوان و تیری
باڵی مەلی ئاشتی خوێنتان بشکێنێ
ملی بەرزی خەباتتان دانەوێنێ

***

ئەی ئاوارە، نەک ئاوارەی هەڵاتن
نەک ڕاکردوو لە چنگی تیژی دوژمن
نەء، وریابی، بەرامبەر مۆری چاوی
یا دەرباز بوون لەژێر قەپی خوێناوی

***

ئەی زمانی هەڵبەستی کوردی شیرین
پەلکی خاوی خەیاڵی وردی زێڕین
تۆ، بە، مایە، بەناونیشان هەژاری
بەڵام بەخوو، بەکردەوە بەرداری
وەرە، شەرتی خێر پەیمانێ ببەستین
کە لە ڕێگەی خەباتا ڕانەوەستین
هەتا لاکی داگیرکەرمان نەنێژین
تامی ئۆقرە و حەسانەوە نەچێژین



## دەمی بەهار(١)

١٩٥٨

*«بەبۆنەی هاتنەوەی قارەمانی کورد جەنەڕاڵ مستەفا بارزانیەوە».*

دەمی بەهار
بەهاری دیارە و دیار
مەست بەبادەی زێڕی گزنگ
کاتێ ئاورنگ
هەریەک نمێ
لەسەر گیا
هەر حەوت ڕەنگەکە ئەنوێنێ
ڕێچکەی چیا
بەرگی بەڵەک ئەنەخشێنێ
هەنگ ئەفڕێ
بۆ مژینی هەڵاڵەی گوڵ
ڕێ ئەبڕێ
بۆ ناو بەهار
بەهاری دیارە و دیار
کاتێ ئاسمان
لەگەڵ نزار
بەبێ وچان
ئەکەونە بەرواردی ڕەنگ
نزار ئەڵێ
بەهار سەوزە
منیش سەوزم
تۆ لە چیویتا بگەوزە
ڕەنگت شینە

(١) دەمی بەهار – ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١٤١١) ٢/١٠/١٩٥٨.

وەکو وەنەوشە ڕەنگینە
ئاسمان ئەڵێ
هەتا زووە
سەری خۆت هەڵگرە و هەڵێ
من نیگاربەخشی سروشتم
ئەوەندەی تۆسقاڵێ بۆیە
لەهەر جێیەکا ڕشتم
مایەی سەرنجدانی تۆیە
ئەوە، کانیی
ڕووبار و گوڵ
باڵندە بەتاکە و پۆل پۆل
دوورڕی تەماشا کردنن
گێژی ئەو دیمەنە شینەن
ئەوقی ڕۆژ بەسەربردنن
دۆش داماوی ئەو بینینەن
بۆ ناو بەهار
بەهاری دیارە و دیار
کام بەهار؟
کام جێگایە؟
هەلبەنی ئەم گفتوگۆیە
یا کام شوێنە
کە بەهار بەم چەشنە جوانەس
یا کام نوێنە کە باسەکەم تیا میوانە؟
وەڵام: وڵات کوردستانە
بەڵام جێگاکە بەرزانە
کاتێ دایک چاوی ساوا
بەگری تۆپ ئەپشکوێنێ
دەسرازەی ئارامی کۆرپە



بەبای شیلک ئەجەرێنێ
دڵی خستنە جووڵە و خورپە
بەگرمەی بۆمبا و نارنجۆک
ئەبزوێنێ
دێ ئەسووتێ
دار بەری کاڵی ئەوەرێ
دووکەڵ بەری ئاسمان ئەگرێ
مەل ئەتەرێ
گوڵ، ئەگەر ڕەنگی سپی بێ
ئەبێ بەشین
بەوێنەی شاخی دەماوەن
چیای شیرین
تەمومژ تۆسقاڵی سووتان
ئەنێرێ بۆ گشت کوردستان
ناچار دایک، بۆ بەخێوکردنی کوڕ
بۆ ژیانی، بۆ بەیانی
ئاواتی دەروونی بڕی
ئەبێ بگەڕێ بۆ ژیان
بۆ هەڵسووڕان
ئەبێ بگەڕێ بۆ ژیان
بۆ کوردستان
ئەبێ بگەڕێ بۆ ژیان
ئەبێ کۆرپە بەخێو بکا
نەشاخ بکا نەشێو بکا
چی لێ بکا؟
ئەبێ ڕۆڵە با بەدایەن
ئەوانەی بۆ ساوا سایەن
بەکام دایەن؟

ئەیدا بەدایەنی خەبات
بۆ ئەوەی بگاتە ئاوات
کوڕ
ئەکەوێتە مەیدانی
پاڵەوانی
لەگەڵ کۆمەڵێ ئینسانی
نیشتمانی
ئەبێ بەجەنگ
ئەبێ بەشەڕ
کوڕ هەروەکو شێرێکی نەڕ
ئەڵێ کوردم
نەوەی کاوەی قارەمانم
من ئینسانم
ئەمەوێ وەکو ئینسانی
ئەم دونیایە
وڵاتی خۆم
چی تێدایە
لە خێر و بێری سامانی
زەوی و کانی
بۆ براو خوشکەکانم بێ
بۆ بەری ڕەنجی شانم بێ
بەڵام دوژمن
هەروەکو سەگێکی نەوسن
ئەکەوێتە ئێسک خواردن
ئەڵێ مردن
ئەڵێ سووتان
ئاوارە بوون
ئەڵێ وڵات بەجێهێشتن



بۆ تۆ و بۆ هاونیشتمانت
بۆ تۆ و بۆ خێزانەکانت
بۆ ناو بەهار
بەهار بەهاری دوانزە مانگ
بۆ جێیە ئینسانەکانی
کامەرانی، وەکو برژانگ
چۆن پەرژینە بۆ گلێنە
ئا لەو شوێنە
شادمانی
پەرژینی چرە بۆ ئینسان
بۆ نیشتمان
لەپڕ دەنگێ
لە نەی گەلێ خۆشتر بۆ گوێ
لە چرا ڕووناکتر بۆ ڕێ
لە ئارام نەرمتر بۆ جێ
بەبێ برانەوە هەردێ، ئەڵێ
عیراق جمهوریە
ئازادیە
سەربەستیە
دونیایەکی پڕ ئاشتییە
بەڵێ، ئەوا چواردەی تەمموز
دوژمن ڕما
ناوی نەما
ئەوا کۆرپەی ئاوارە بوو
ڕووکەرە وڵاتی باوک
بۆ میللەتان
کەوتوونە ڕێ
بۆ کوردستان

ئەوا شیرین
قەندیل و هەڵگوردی
نەخشین
ئەوا شاکەل و شیروانە
تێکرا وا زەماوەندیانە
هەڵئەپەڕن
بەڵام هەڵپەڕکێی شێخانە

***

## جەزائیر

با ڕەهێڵەی دەسرێژی تیژ
گوللە باران
ببوەرێنێ
گەڵای تەمەنی لاو و کیژ
دوای بۆردومان
کە سووتا درەخت و گیا
دەشت و چیا!
کە بوو بەکۆمەڵێ ئاگر
یا بوو بەکۆمەڵێ پشکۆ
لاشە و سەر و دەست و ئەستۆ
یا بوو بەکۆمەڵێ خەڵووز
مەلۆتکەی منداڵی ساوا
لەبن خانووی هەڵوەشاوا
هیچ نابینێ
دووکەڵ نەبێ
باڵ و جەستەی پەل پەل نەبێ
یا هەناسەی نووزەل نەبێ
کەچی ئەو خوێنە ڕژاوە



ئەو ئێسک و گۆشتە سووتاوە
ئەو قوڕگە نووزە تیا ماوە
ئەبێ بەدەم
بەهاوار کردنێکی کەم
هێندەت زانی
قەدپاڵ و لوتکە و ئاسمانی
ئەو وڵاتە
پڕە لە چاو
پڕە لە قین
لە هەست و لە جۆش و لە تین
مەرز و بووم پڕ لە ورتە
بن دارە و پڕە لە خرتە
لە پڕڕ،
هێرش، بۆ سەر دوژمن
تەقە و هاوار
ئەشڵەقێ گۆمێکی بێ بن
یا بەتەوژمی پەلامار
ئەپەڕێ مل، سەر و گەردن
یا تەقەی مێشکێ بەتەور
ئەگاتە ناو دوو توێی هەور
یا پەنجەی سەر مشتوی خەنجەر
ئەگاتە سەر پێستی کەمەر
یا گوللەی کوڵ
زرمەی بێ دەنگی ئەدرێ
نەک سێ، شەش و حەوتێ ئەبڕێ
***
ئەی گەلی جەزائری جیر
منیش وەک تۆ

له (سەلماس) و (چهریه) و (خۆ)
یاخو له (وان)
له (باشقلّه) و دەشتی (بۆتان)
له (ئاگری داغ) یا له (دەرسیم)
دوژمن، تێر خوێناوی مژیم
تێر سووتانی
تێر برژانی
بەڵام وا ئەو گەله جیرِڕە
ئەو سەرسەختە
سەرنجی ئاڕاستەی
چاوڕێیه
وەک تۆی بەکێش
ژیلەمۆی ژێری خۆڵەمێش
بەبای خەبات بێتەوە گڕ
وەک تۆی له پڕ
شەبەیخوون له دوژمنی کا
بەیەکجار سەرەو بنی کا

***

## بێکەسی خەباتکەر[1]

قـــوربانـی تۆزی ڕێگەتم ئەی گـردەکــەی بەرین
وەی مــەرزی شـارەزا بەهەمـــوو شـاری ئاگــرین
ئەی ســروەکـەت سـەبارەتی هاندانی ئەم گــەله
وەی ڕەنگەکـەت له بەهار نیـشـانی شـۆڕوشین
کـاتێ کـه ئاڵ و ســوور ئەبێ تارایی ئەرخـەوان
وەک خـــوێنی شـــەهیــدانی ڕێگای ڕاپەڕین
جــــۆشش ئـەدا بـەدڵـی یـارانـی بـاوەفــــا
پـەیمان ئـەخــــاتـەوە بیـــــر لاوی چاو بەتین
پـرسێ بـکـه لەوانـەی لـه دەوروپشـــــــتی تـۆن
(بێکەس) خـەیاڵی وردی کـەوتۆتە هەڵفـڕین
پرسێ بکه له جـــووته شــەهیــدی ڕێگەکـەی
خــۆشناوی کـــردەنای و حـــەمـــەی ئاوازی ژین
ئایا گـەل کـەسانی بەخـشـیـوی گـیـان و سـەر
ئیـستێ له کـامـه جێن و ئاخۆ خـەریکی چین؟!
مـــوژدەی بەرێ بەگـــورجی و شـــاباشی لێ بکه
پێـیـان بڵێ بەگـەرمی دەست کـەن بەهەڵپـەڕین
مـوژدەی بەرێ کـه چواردەی تەمـوزی بەد شکێن
ئاواتەکـــەی ئەوانەی گـــەیانه جـــێی یەقین
مـوژدەی بەرێ کـه چواردەی تـەمـوزی خـەمـڕەوێن
شـــــــەرابەکـــــــەی ئـەوانـی تـۆش، ......
بۆ ئێـــــمــــه شــــادی هێنا بۆ دوژمنانه شین
عـبـدالکریم لەپێـشـەوە و گـەلی لەپشـتـەوە
هەندێ بەدەست و پێ له کۆتو هەندێ بەسەر بڕین
دوژمن هەروەکـــو بەفـــرەکـەی ســالآن توایەوە
هەندێ لەژێر پێی گـــەلا و هەندێ بەهەڵدڕین
ئێسته هەروەکو خۆت وتت بێکەس بەشیعرەکەت
کـــورده لەگـــەڵ عـــەرەبدا وەکـــو برا ئەژین

١٩٥٨

***

(١) ڕۆژنامەی (ژین) ژماره (١٤٢٣) ١٩٥٨/١٢/٢٥.

## شێخ مەحموودی تێکۆشەر(١)

بەخولێکی تر ئەستێرەی مرۆڤدار
نەوەی کاوەی گەیانەوە یادی پار
کام یادی پار؟ کام مرۆڤی سەری رووی بووم(٢)
یادی کۆچی ناو کاتێکی بەد و شووم
یادی کەسێ بەرووبوومی پەیمانی
بەغدای رزیو هات کردی بەقوربانی
کۆچی کەسێ لە تەقەلای بێ بەش بوو
ژینی شۆڕش، مردنیشی شۆڕش بوو
کۆچی سەرەک شێخ مەحموودی کوردپەروەر
رۆڵەی گەلی راپەڕیوی جەنگاوەر
کوڕی ساتی، مردن بێ نرخ هەرزان بوو
خۆ بەخشینی لە لا هیچ و ئاسان بوو
هەتا کاتی ناهەمواری زەمانە
تەمەن زۆری فڕوفێڵی بێگانە
پەنجەی تەقەی تا ڕادەیەخست لە گۆ
کشانەوەی لا باشتر لە شەڕوشۆ
کام یادی پار، کام مرۆڤی سەر رووی بووم
یادی کۆچی ناو کاتێکی بەد و شووم
کاتێ نێچیر بۆ داوی دوژمن گەل بوو
کاتێ وەچەی بەدفەسالی تولوز خان
قینی کۆنی هێنابووەوە کوردستان
بەتەما بوو بەزووخاوی ناپاکی
تا تەنانەت وشەی کوردی زگماکی
قەدەغە کا لە شارێکا زنجیرەی

(١) رۆژنامەی ژین، ژمارە (١٤١٢) ٩/١٠/١٩٥٨.
(٢) بووم: زەوی.



تێکۆشانی نەشتەرە بۆ ئەو بیرەی
ئەی شێخ مەحموود ئەی ڕوو لە بەرزی کوردی
تۆ نەمردی هیچ کەسێ ناڵێ مردی
بەڵام یەک ئاخ نەکەوتیتە ئەم کاتە
وڵات باخچەی پڕ گەشەی ئاواتە
ئاسۆی هیوای نەتەوەی کورد بەیانە
برایەتی کورد و عەرەب نیشانە
کەریم گوڵ بوو، برا بوو پشت و کەس بوو(١)
لەتاریکی شەودا فەریاد ڕەس بوو
کەریم کەس بوو، گوڵێک بوو، وەک چرا بوو
درەختێک بوو، پەنایە بوو، برا بوو
نەمامێ بوو لە باخچەی ژینی کوردا
قەڵایێ بوو لە هەستان و نەبەردا
وەکو مۆمێ لە تاریکایی شەودا
ئەسووتا بۆ کەسوکاری بەسەودا
هەتا چاوی لە کوردستانا بمێنێ
کەریم ماوە لە دڵدا هەر ئەمێنێ

١٩٨٣

***

## شینی فازل و فەهمی(٢)

«بەبۆنەی تێپەڕبوونی شەشە مانگ بەسەر کۆچی دواییانا»

ئەی برا گەل شیوەن کەن
پێی شادی لە پێوەن کەن
مەینەت بهێننە کایە
گریان بکەنە مایە

(١) ئەم شیعرەم بەدەستنووس لە کاک (هونەر دیلان) وەرگرتووە.
(٢) رۆژنامەی ژین، کاکەی فەللاح، ژمارە (١٥) ١٩٧١/٣/٢٥.

بالڵا شین و ڕەشپۆش کەن
منالڵی خەم لە کۆش کەن
هەنسک بکەن بەپیشە
خۆشی بکەن لە ڕیشە
کوێ پڕ لە نالڵە نالڵە
جێگای فرمێسکی ئالڵە
گوێ پڕ گریە و فغانە
لە، ڕوو، لە، سنگ، کوتانە
کوێ پڕ لە ئاهی سەردە
پڕ لە دووکەڵ و گەردە
کوێ پڕ لە شینی خەستە
ئەو جێگەیەم مەبەستە
ئەوێ بکەن بەجێگەی
گری شیوەن و ڕێگەی
ڕۆین بۆ گردی سەیوان
بۆ سێبەری ئەرخەوان
ئەوێ ئەکەین بەمەنزڵ
بۆ دوو گوڵی جوانی گڵ
بۆ پشووی دوو هەناسە
بۆ یادگار و تاسە
بۆ دەرچوونی پشوویان
لە جەستەی هیلاک بوویان
سووک بیانخەنە گوڵدان
لەبەر شکانی ئێسقان
ئازار مەدەن بەلەشیان
بەپێستی سوور و گەشیان
بەخوێنی سەر برینیان
بەقۆڵی سەر سەرینیان



بەچاوی پڕ لە خەویان
بەگۆشتی پڕ لە هەویان

***

ئەی برا گەل شیوەن کەن
شادی پێ لە پێوەن کەن
خەفەت بەخەڵک بنۆشن
ڕەشی بەمن بپۆشن
بۆ دوو گوڵی وەتەنمان
نەسرین و یاسەمەنمان
سوور هەڵگەران لە بەرگا
سووتان لە دەشتی مەرگا

***

ئەی دایکی کورد زوبانم
من ڕۆڵەی کوردستانم
کوڕی ئەم شاخ و هەردەم
مەلۆتکەی ئەو بن بەردەم
پاراوی دەم بەهاریم
قاڵی شەوگاری تاریم
فێری زستانی سەختیم
چەپکە گوڵی بەدبەختیم
لە پایزی ولاتا
لە گێژاوی خەباتا
وا بووین بەقۆچی قوربان
ئەی برا گەل ئەی دۆستان
سادەی کۆمەڵێ سازکەن
بانگەوازێ ئاواز کەن
بڵێن شیوەن و شینە
بۆ فازیلە و بەتینە

بۆ فەهمیە و بەگەرمی
فرمێسک بڕژێنە تەرمی

١٩٧١/٣/٢٥

***

## لاووک(١)

١٩٥٣

کیژ:

هۆ کاکەی شوان، کاکەی ناوشاخ
چاوەڕێی سۆزە، گوڵی باخ
ڕاوەستاوی سیحری فووتن
ئاوارە و سەرسامی خووتن
هۆ کاکەی شوان، کاکەی قەدپاڵ
کەرەک لەبەری پشتێن شاڵ
لاکەرەوە بڕوانە دوور
بڕوانە دەشتی سەوز و سوور
بڕوانە بریقەی نزار
بڕوانە دەریای لالەزار
بیانهەژێنە بەشمشاڵ
بیانهێنەرە ناڵە ناڵ

شوان:

هۆ کیژی شەنگ، هۆ کیژی شەنگ
مەیفڕێنە خەیاڵی مەنگ
مەستی بۆنی گیای شاخانم
گێژی بریقەی داخانم
سەرسامی چریکەی بەردم
ئاوارەی گوڵاڵەی هەردم

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١١٤٣) ١٩٥٣/٤/٣ بەناوی (م.ص.د).



شەکەتی ڕۆژی بەهارم
تینووی خاڵ خاڵی نزارم
دوای پەپوولەی ڕەنگین کەوتووم
بۆم نایە فووم، بۆم نایە فووم

کیژ:

هۆ کاکەی شوان، کاکەی ماندوو
ماندووی ڕۆژگاری ڕابوردوو
بەس ڕایوەشێنە گاڵۆکت
بەس لە دڵ گیرکە نینۆکت
دەم بخەرە سەر خونچەی دەم
با بپشکوێ گوڵی ناو چەم
تۆزێ تینوێتیت بشکێنە
تۆڵەی خۆت لەمن بسێنە
منیش وەک تۆ لەش پڕ زامم
هەروەک تۆ جەستە و ئەندامم
هیلاکی کاری بێ بەرە
کون کون و پڕ کەلەبەرە
وا هەردووکمان بۆ درێژی ساڵ
ڕەنج ئەدەین بۆ چاوێکی کاڵ
تۆ ساڵ دوانزەی مانگ هەرداوهەرد
من شەو و ڕۆژ مەینەتی و دەرد
نەک من و تۆ هەموو هەموو
بەهەزار نەوەک یەک و دوو
ئەبرێ بۆ یەکێ، بۆ ناوێ
بۆ بتێ، هەیکەلێ، چاوێ
دوایان هەر هەناسەی سەرد
من بێ خەوی و تۆ هەردوبەرد
بیهێنە جۆش لولکی دەم

پێی بە با دەین ئازار و خەم

شوان:

هۆ کیژی جوان، هۆ کیژی جوان
ورد وەرە پێش نەرم و نیان
مەیبڕەوە حەبرانی دڵ
با سۆزی لاوک بێتە کوڵ
ژێر بەڕوو بێ شوێنی گوفتار
بۆم مۆڵ دە ڕانی بەرخ و کار
بێ، سەرێ کەمە سەر ڕانت
چاو، برمە هەردوو چاوانت
دەم بخەمە سەر گوڵی گەش
تۆزێ دەرچێ هیلاکی لەش
ئەوسا تێن یەتەوە گیانم
پێی ساڕێژ ئەبێ زامانم
لێی ئەدەم بەفووی دوو لێوان
هەی هاوار ئامان سەد ئامان

کیژ:

هۆ کوری شۆخ، هۆ کوری شۆخ
تەزووت گەیانە ئێسک و مۆخ
گەیانتە گیانی هیلاکم
گەیانتە ناو سینەی چاکم
بەلام وا کەوتەوە بیرم
ڕای وەشان تەوق و زنجیرم
ساردی گەیانە جگەرم
قورسی خستە تەوقی سەرم
پێش بردنی هەلالەی لێو
بۆ شانەی دڵی سەودای کێو
بیرکەینەوە لە بەهارێ



لە ڕۆژێ، دەرمانێ، چارێ
ڕزگارمان کا لە دەرد و خەم
ئازار نەمێنێ زۆر و کەم
بەری ڕەنجی فراوانمان
بۆ خۆمان بێت و باوانمان
پێی سارێژکەین برینی لەش
تانووت بەین لە گولاڵەی گەش
هەڵکێشین هەناسەی پشوو
بینێژین یادی ڕابوردوو

هەردووکیان دەست ئەکەنە مل و بەهەڵپەڕکێوە ئەڵێن:

هۆ ئاسۆی سوور، هۆ ئاسۆی سوور
خۆت دەرخە لە دەم کەلی دوور
لەگەڵ ئاسۆی ئەرخەوانی
دیاری تۆ بێ، کامەرانی

***

«لە بەرەبەیانی شۆڕشی چواردەی تەموزی ١٩٥٨دا دیلان ئەم شیعرەی نووسی و لە ئێستگەی ڕادیۆیی کوردی بەغدا ئەخوێندرایەوە»

## چواردەی تەموز(١)

بریقەی شێرە یا ئاسمانە ئیمرۆ
نەڕەی شێرە وەیا لاوانە ئیمرۆ
چریکەی ڕۆژەکەی شادی ولاتە
وەیا کاتی لە خەو هەستانە ئیمرۆ
تەپ و تۆزی نەبەرد و ڕاپەڕینە
وەیا خۆڵی هەرەس هێنانە ئیمرۆ
لەبن هێنانی دەستەی گەل فرۆشە

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارەی تایبەتی واتە ژمارەی لەسەر نییە، ١٩٥٨/٧/١٤ ڕۆژی چواردەی تەموزی ١٩٥٨ یەکەم ڕۆژی شۆڕش.

وەیا گرمەی ڕمانی ژانە ئێمڕۆ
مانی ژانە یا زنجیرە ئەشکێ
وەرن کوردینە بنوارینە لاشەی
بەچنگی تۆڵە وا داخانە ئێمڕۆ
شکانی دارە یا زیندانە ئێمڕۆ
وەرن کوردینە بنوارینە خانەی
سەرەوژێر و هەمووی وێرانە ئێمڕۆ
سەرەوژێرە تەلار و کۆشکی شاهی
وەیا دەشتی بەزم گێڕانە ئێمڕۆ
دەبا دەست بێ لەناو دەستی دلێران
بخوێنن بەستە کە حەیرانە ئێمڕۆ
بەحەیران بۆی بلێین یاخو بەلاوک
کە جەژنی بەرزی ئازادانە ئێمڕۆ

## بواری شیعر[1]

شیعر دەرکەوتنێکی کۆمەڵایەتییە، بەواتەی کە کۆمەڵ ڕێکخرا و بەرەو پێشەوە چوون و یەکگرتن ڕۆیشت، دەرکەوتنە کۆمەڵایەتییەکە دیارد بەرچاو ئەکەوێ. پێشڕەوە سیاسییە کۆمەڵایەتیەکان وایان دەربڕیوە لە دیاردەی ئێمەوە (شیعر) زانینە، تێبینە، ڕێ نیشاندەرە، ڕێگا خۆشکەرە بۆ چوونە ناو بەهەشتی ڕزگاری و ڕزگاربوون لە دۆزەخی نۆکەری. بەم شێوەیە ئەبێ بڕوانینە (شیعر) وتن بۆ میللەت.

شاعیرە گەورەکانی وەکو (مەولەوی، سالم، نالی، مەحوی... هتد) ڕێ نیشاندەر بوون، دەروون پاککەرەوە و ڕێی پاکی نیشاندەر بوون هاندەری خەڵکی بوون بۆ دوورکەوتنەوە لە ناڕاستی. ناهەمواری، ڕاڕایی، سڵەمینەوە لە ڕێگای چەوت و چەوێڵ گرتن، بەربەرەکانی کردن لەگەڵ ئەهریمەنی سزادان و ئێسک شکاندن و تەڵەکەبازی کردندا. یان جوانی وڵات و خۆشەویست کردنی لای خەڵکەکەی بەشیعری پاراو و پڕ مانا و قووڵ و پڕ لە زانینەکان. لای گەورەکانی شیعر وەکو ئەو چوار شاعیرە گەورەیەی کە لە سەرەوە ناوە خاوێنەکانیان برا، شیعر بێجگە لە ڕێی، ڕاست نیشاندان و دوورکەوتنەوە لە ڕێی چەوت، شیعر بەخەڵک فێرکردن، ڕەوشتە، ئەدەبە، هەڵسان و دانیشتنە، بەرەڵاکردنی لێکدانەوەی دەروونییە، ئەو شتە تایبەتیانەیە کە لە مرۆڤا شاردراوەیە و سوودبەخشە بۆ کۆمەڵ و پێویستە پوختەیی و قازانجی بەهەموان بگەیەنێ. لە چوارچێوەی ڕوانینی یەکێ لە شیعری ئەو شاعیرانە بێجگە لەوانەی باس کرا گوڵاو پرژێنی سەوچاوی ڕادەی میللەتەکەمان ئەکات، داکوتەری زمانەکەشمانن و هەوڵدەرن بەشیعر بۆ لەناو نەچوون و پەرت و بڵاو پێ نەکردنی زمانی شیرینی کوردی.

زمانی کوردی، زمانە، خاوەنی قووڵپەکی داکوتراوی بناغەدارە، زمانێک نییە لە چەن زمانێکی ترەوە وەرگیرابێ و دڕکبێژ کرا بێ. زمانێکی بڵاوە مانا بەرینە، خۆش گوفتارە، بەتایبەتی شێوەی کرمانجی خواروو. چاو هەڵهێنان بەیەکێ لە قەسائیدەکانی ئەو شاعیرە گەورانەی کە پەنجە بۆ ناوە پیرۆزەکانیان ڕاکێشرا ڕاستی مەبەستەکە بەشەوقداری دەرئەخا. تا ئەم هەناسەیە، لە هیچ ماوەیەکدا، چە لە دەرکەوتن لەسەر لاپەڕەی گۆڤار و ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکاندا لە زووەوە تا ئیمڕۆ، تا ئێستا بەخۆمم نەوتووە شاعیر. تا ئەم هەناسەیە لە دەرکەوتنەکانی تەلەفزیۆندا خۆم بەخۆمم نەوتووە (شاعیر) نەک لەبەر بێ دەسەڵاتی و لە بارا نەبوون نەک لە ترسی پێنووسی کۆڵ و چرپەی درز، نانا لەبەر ئەوەی کە ئەڕوانمە دەروون و دەسەڵات و زانین و زانیاری و

(١) ئەم نووسینەم بەخەتی دیلان خۆی لەلایە. لە کاک (هونەر دیلان)م وەرگرت.



لێهاتوویی ئەو چوار شاعیرە گەورەیەی کە باسم کردن لە وزەما نامێنێ خۆم بەرمە ڕیزی ئەوان و بەخۆم بڵێم (شاعیر)؟ من خۆم ڕێ بەخۆم نادەم بڵێم (مەولەوی، سالم، نالی، مەحوی، دیلان) چونکی (ستیڤان زڤایج) کە باسی تۆلستۆی ئەکات ئەڵێ (من لە کەلەبەرێکەوە ئەڕوانمە چیایەک). نەک من خۆم بکەم بە(ستیڤان زڤایج) بەڵام ئەم چوار شاعیرە بەڕادەی تۆلستۆی گەورەن و دامان و لێ ڕاوەستان و بیرکردنەوەی ناوێ بۆ هەڵکردنی ئاڵای گەورەیی ئەوان. تا ئەم هەناسەیە بەشان و باڵی خۆما هەڵدەر نەبووم. خەڵک فێرکەر نەبووم لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانا لە سەرم بنووسن، هاندەری کەس نەبووم، بێ جێ بەرزم کەنەوە، بێ ڕێ، ڕێم بۆچۆڵ کەن، من بەجێ و بەڕێ خەڵکم خۆشویستووە، داماوی هاوڕێ و برا و کەسوکار دۆزینەوە نەبووم. پێویستم بەچەپڵە کوت نەبووە! لە شارێکا بووم و لەناو میللەتێکا تەمەنم گەیشتۆتە نزیک شەست لە گیانەڵای مردنا لە خەستەخانەی دڵ بەنووسینی شیعر خۆم کردووە بەقوربانی میللەتەکەم و خۆزگەی ژینم ئەوەیە بم بەقوربانیان.

***

## شەشی ئەیلول- ڕۆژی قوربانیدان[1]

ئیمڕۆ لە هەموو سووچێکی کوردستانی عیراقی ئازادا هەموو کوردێکی دڵسۆز، هەموو عەرەبێکی خاوەن دەروون، لە عیراقی چواردەی تەموزا بەهەستێکی قین تیژکردنەوە دووبارە تەڵەکەکانی ئیمپریالیزم ئەهێننەوە پێش چاوی خۆیان، ئەی هێننەوە پێش چاویان کە دووبەرەکی نێوان کورد و عەرەب ئیمپریالیزم گڕەکەی خۆش ئەکرد کە مافەکانی نەتەوەی کورد ئیمپریالیزم ئەیخستە ژێر پێیەوە. کە کلکەکانی ئیمپریالیزم برایەتی کورد و عەرەبیان تێک ئەدا وە... هتد. هەمووان ئەیزانین ئەگەر هەندێک ئەیانەوێ بزانن کە (شەپەرت) لە سلێمانی ئەهات بەنیشتمانپەروەرەوە کوردەکانی ئەوت: (بڕۆن داوای هەقی خۆتان بکەن، لەو لاشەوە بەدەسگای حکومەتی ئەوسای ئەوت بڕۆن بیانکوژن ئەمانە گێرەشێوێن و ئاژاوە چین!). لەلایەکی ترەوە نەتەوەی کورد لە عیراقدا بەتەمای ئەوە بوو ئەو پەیمانەی کە ئەبەسترێ لە نێوان عیراق و بەریتانیادا ئەبێ چەند بەندێکی پەیوەندی هەبێ بەمەسەلەی داننان‌دا بەهەقەکانی نەتەوەی کورددا. کەچی بەندەکانی پەیمانەکە بڵاوکرایەوە و هیچ جۆرە باسێکی نەتەوەی کوردی تیادا نەبوو، تا، ناویشی نەهێنرا! ئیمپریالیزم ئەیویست پەیمانەکە ببەستێ بەڵام لە بەغدا

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١٥٥٨) ٥/٩/١٩٦٠.

بەربەرەکانیەک هەبوو لەلایەن نیشتمانپەروەرەکانی عەرەب ئەیان وت پەیمانی ١٩٣٠ زنجیرێکە ئەکرێتە پێی گەلی عیراقەوە نیشتمانپەروەرە کوردەکانیش ئەیان وت پەیمانی ١٩٣٠ ناوی کوردی تێدا نییە لەبەر ئەوە هەڵبژاردن ناکەین نوێنەر نانێرین بۆ ئەو پەرلەمانەی ئەو پەیمانە مۆر ئەکا کە هەقی نەتەوەی کوردی خستۆتە ژێر پێوە. (هەڵبژاردن ناکەین) دروشمی بەرزی کۆمەڵانی خەڵکی سولەیمانی بوو لە نیوەڕۆی ڕۆژی شەشی ئەیلولی ١٩٣٠دا. ئیمپریالیزم ئەیەوێت بەبەردێ دوو چۆلەکە بکوژێ. وەکو لەسەرەوە وردەیەک لێی دواین، ویستی ڕوونی ئەکەینەوە. لە سولەیمانی خەڵکی هان ئەدا ئەی وت داوای هەقی خۆتان بکەن بەدەسگای حکومەتیشی ئەوت: بیانکوژن، بۆچی؟ ئەیویست موعازەرەی بەغدا بەکورد بترسێنێ کە نەکەن بجووڵێنەوە ئەگینا کورد داوای هەقی خۆی ئەکا، بەدەسگای حکومەتیشی ئەوت بیانکوژن بۆ ئەوەی دووبەرەکی لە نێوان کورد و عەرەب دروست بکا چونکە ئەیزانی تێکۆشانی برایانی کورد و عەرەب دەسەڵاتی ئەو ئەڕووخێنێ. ئەیزانی ئەگەر بێت و ڕۆژێ ئەم کورد و عەرەبە یەک بن مەسەلەکە خراپ ئەبێ و ناتوانێ تەڵە بنێتەوە بۆ مانەوەی دەسەڵاتی.

ئیمڕۆ لە کاتێکا یادی ئەو قوربانیانە ئەکەینەوە کە لەبەر ناو نەهێنانی نەتەوەی کورد گیانی خۆیان بەخشی ئەبێ ئەوەمان لەبیر بێ کە ئیمپریالیزم ئێستاش لە تاریکیدا کار ئەکات بۆ تێکدانی برایەتی کورد و عەرەب بۆ شێواندنی یەکێتیان بەو تەمایەی کە پێیەکان بگێڕێتەوە شوێنە لێ هەڵکەنراوەکانی.

ئیمڕۆ لە کاتێکا یادی ئەو قوربانیانە ئەکرێتەوە ئەبێ ئەوەیان لە بیربێ (ئەوانەی کە ئەڵێن یەزیدی و جاف و کاکەیی و پشدەر و بلباس و ئاکۆ عەرەبن) ئەبێ لە بیریان بێ ئەو قوربانیانەی کە بەئەسڵ یا جاف و پشدەری یا بلباس بوون و لەبەر دەرکی سەرادا کوژران وەزیری داخلیەی حکومەتی ١٩٣٠ لەو بەیانەدا کە لە بەغدا بڵاوی کردەوە دەربارەی شەشی ئەیلول، ئەو قوربانیانەی ناو نا (رعاع) وە تێکڕا ئەبێ ئەوە بخەینە پێش چاوی هەموومان کە بەهێز کردنی برایەتی کورد و عەرەب یەکێکە لە مەرجە بناغەییەکانی پاراستنی کۆمارەکە. وە ڕێزگرتنی مافەکانی هەردوو نەتەوە کە دووبارە مەرجێکی بناغەییە بۆ پێشخستنی بۆ گەیشتنە ئامانجەکانی لەژێر سایەی ڕژێمێکی دیموکراتی ئازاددا.

١٩٦٠

***



## شێخ لەتیفی شێخ مەحموود و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی نەتەوەی کورد[١]

وەکو زنجیرەیەکی نەپچڕاو لە تێکۆشانی بێو چانی نەتەوەی کورد بنەماڵەی شێخان لە دروستبوونی یەکەم ڕابەری نەتەوەی کورد کە لە شێخی گەورە شێخ مەحموودەوە دەست پێ ئەکات بزووتنەوەکە لە باوکەوە بۆ کوڕ مایەوە. پاش ناچاربوونی خۆدان بەدەستەوە و دوورخستنەوە بۆ خوارووی عیراق لە هەڕەتی لاویدا شێخ لەتیف بوو بەکوێر نەکەرەوەی ڕێڕەوی باوکی. هەوڵ و تێکۆشانی لەگەڵ چەند پیاو و لاوێکی دڵسۆز وەکو (شێخ لەتیفی دانساز و مەلا ئەسعەدی مەحوی دکتۆر نوری فتوحی) بەناوی (حیزبی برایەتی)یەوە بۆ ئامانج و هەستەکانی نەتەوەی کورد ئاشکرا و دیارە. بەگژاچوونی کۆمەڵێک لەو پیلانانەی کە ئەگێڕرا بۆ ئابڵوقەدانی گیانی نەتەوەپەرستی لە ساڵەکانی پێش ١٩٤٠دا لەلایەن ئەم حیزبە تازە دروستبووەی ئەوساوە بەهەست و تینی بەردەوامی شۆڕشی نەکوژاوەی نەتەوەکەمان ئەدرێتە قەڵەم. کە شێخ مەحموودی قارەمان ڕابەری بوو، لەپاش ئەوە ئیمپریالیزمی ئینگلیزی دەستی ژەن لە بەکرێگیراوەکانیەوە بۆ ئەوەی شێخ لەتیف بگرن. ناچار بوو پەنا بۆ کوردستانی ئێران بەرێ کە سوپای یەکێتی سۆڤیەتی دۆستی نەتەوەی کوردی دێرینی تێ ڕژابوو. بوونی شێخ لەتیف شێخ لە سەردەشت لە ساڵەکانی ١٩٤٣-١٩٤٤ تا ١٩٤٥ بەڵگەی ڕاستی دۆستایەتی نەتەوەکەمانە کە شێخ لەتیفی شێخ مەحموود بەهاوکاری لەگەڵ کۆمەڵەی (ژ.ک)ی ئەوسا و حیزبی دیموکراتی کوردستان لەپاشا بەڕابەری شەهیدی گەورە قازی محەممەد هەیان بوو لەگەڵ یەکیتی سۆڤیەتا. لەپاش لێکدانەوەی ڕۆشنبیرانی کورد و بەتەمای لەناوبردنی کەرتوپەرتی ناو بزووتنەوەی کورد بەتێکڕایی مەسەلەی دروستبوونی حیزبێکی تایبەتی بۆ کوردی عیراق یەکەم کێشەی ئەو ڕۆژە بوو. پاش ئەوەی شێخ لەتیف زۆر بەڕێزەوە لەسەردەشتەوە گەڕایەوە بۆ سلێمانی لە ئەنجامی تێکۆشانی شێخ لەتیف و هاوڕێکانیدا وە بەئاراستەکردن و دەست نیشانکردنی پێشەوا بارزانی پارتی دیموکراتی کورد دروست بوو. شێخ لەتیف بوو بەجێگری سەرۆک. لەپاش تێکشکان و هێرشی ناڕەوای حکومەتی شای ڕزیو بۆ سەر کۆماری تازە کۆرپەی کوردستان شێخ لەتیف بوو بەپەنا و داڵەی ڕۆڵە لێقەوماوە پەناهێنەرەکانی کوردستانی ئێران پاش کشانەوەی مێژوویی بارزانییەکان بۆ شۆرەوی.

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (٦٩) ١٩٧٢/٥/٢٥ ساڵی دووەم.

دڵی فراوانی شێخ لەتیف، بەتەنگەوە نەبوونیماڵی دنیای هەمیشە ئاشکرایە، لەو ڕێگە پیرۆزەدا، ڕێگەی پشت نەکردنە نەتەوەکەی. لە ساڵەکانی پەیمانی بەغدای لەناوچوودا لە کاتی هێرشەکەدا بۆ سەر نەتەوەی کورد و هەرێمی سولەیمانی بەتایبەتی ساڵەکانی (١٩٥٤، ١٩٥٥، ١٩٥٦) شێخ لەتیف بەحەوت ساڵ حوکمدان زیندان کرا.

ساڵانی درێژی ناو زیندانی شێخ لەتیف و ناسۆری کۆچی دوایی باوکی کەڕابەرێکی بێ وێنەی نەتەوەکەمان بوو تووشی هەمە جۆرە نەخۆشی کرد. پاش شۆڕشی چواردەی تەموز و هاتنە دەرەوەی شێخ لەتیف لە زیندان لەگەڵ تەوژم و لێشاوی پاش چواردە بەهەموو هێزێکەوە ڕۆیشت، ئەوەشمان بیر نەچێ کە یارمەتی برا بەرزانییەکانی داوە بەسەرەک مستەفا بارزانیشەوە بۆ دەرباز بوونیان لە سەردەمی دەستبەسەریانا لە سلێمانی. هەڵسوکەوتی شێخ لەتیف لە دە ساڵی ڕابوردووی شۆڕشدا وەکو مرۆڤێکی زۆر شارەزای دڵ و دەروونی ئەم خەڵکەبوو، خۆڕاگرتنی لە دەرەوە پارێزگاری کردنی لەو پەیوەندیانەی کە بەهەموو جۆر خەڵکی کوردستانەوە هەیبوو. خەڵکە نیشتمانپەروەرەکانی کوردستان بەڵگەی ئەوەیە کە ئیمڕۆ داخ بێ لە دڵمانا.

پرسە بۆ بنەماڵەی شێخان، هەزاران چەپکە گوڵ بۆگیانی پاکی شێخ مەحموودی گەورە، بۆ گیانی شێخ لەتیفی خێر لەخۆ نەدیو.

١٩٧٢

***

# شاعیری گەورە مەولەوی[١]

بۆ بەرچاوی هەموو شیعردۆستانی جوانی وڵاتەکەمان، کە بەشیعر توانیویانە گەورەیی و جوانی ئەم کۆمەڵە شاخانەی کە پێی ئەوترێ (کوردستان) دەربخەن. مەولەوی نیگارکێشە، وێنەگرە، لەوەتەی زمانی شیرینی ئەوترێ، شیعر ئەوترێ، نووسین ئەوترێ، قەڵەمێک لە بۆتەی خەیاڵی چاک چاوکراوەی باش سەرنج گرتن ڕێکوپێک چوون و هەست و دەرخستنی جوانی سروشتی ئەم وڵاتە نەبووە، کەسێک وەکو مەولەوی دڵ ڕاکێشەر بێ، گیان ڕاکێشەر بێ، هەست ڕاکێشەر بێ.

گەورەیی مەولەوی لە دوو شتدا دەرئەکەوێ:

یەکەم: دەرخستنی جوانیەکانی مەڵبەند و شاخ و دەشت و چوار وەرزی ئەم کوردستانە.

(١) گۆڤاری بەیان ژمارە (١١٥) ساڵی ١٩٨٥.



دووەم: بەراوردکردنی جوانییەکانی وڵات لە بەهاردا کە ئەڵێین لە بەهاردا بەتایبەتی لە بەهاردا لەگەڵ ئازار و دەردەسەری و ئێش و ژان و بێ چارەیی مرۆڤ لەم وڵاتەدا. تەرخانکردنی شێوە بەجوانترین زەڕکەفتی بەڕەونەقی بەهار کردی بەقوربانی مرۆڤی وڵاتەکە. یاخود دەرخستنی شێوەی جوانی بەهار بەراوردکردنی و کردنی بەقوربانی ئینسانەکانی دەوروپشتی.

ئێمە لێرەدا ناچارین جۆرێک لە شیعرەکانی ئەم شاعیرە گەورەیە بۆ وێنە و نموونە بهێنینەوە، شی کەینەوە، بیخەینە سەرچاوەی ئەو کەسانەی کە تا ئێستا لە شیعری کوردی بەباشی نەگەیشتوون، لە شیعری کوردی بەڕەوانی نەچۆتە تێگەیشتنیانەوە. لە شیعری کوردی تا ئێستا کەم ئاگا و کەم زانین بوون، لێی نەکۆڵراوەتەوە یان نەیانتوانیوە لێی بکۆڵنەوە یا دەستەڵاتی شیعر یەکالا کردنەوەیان نەگەیشتۆتە ئەو ڕادەیە یان مەبەستی شیعردانانی ئەم شاعیرە گەورەیە چی بووە. لەپێشەوە وتمان: مەولەوی شاعیرێکی گەورەیە، خوێنەرێکی گەورە بووە، ئاگایەکی تا ڕادەیەکی زۆر لە دیوانی شیعری شاعیرە فارسەکان بووە، مامۆستایەکی گەورەی (ئەدەبی عەرەبی، شیعری عەرەبی، لاکانی شاعیرە عەرەبەکان بووە).

دەرهەق بەعیلمی تەسەوف، عیلمی کەلام، فەلەک، هەموو جۆرە کتێبێکی ئایینی لەم بارەدا مامۆستا بووە. جۆرەها شەرحی لەسەر کتێبە دینیەکان هەیە بێجگە لەوە کتێبی چاپکراوی دەرهەق بەستایشی (تەصەوف) هەیە.

بۆ وێنە کتێبی (العقیدة المرضیة) باشترین بەڵگەی شارەزایی و مامۆستایی و بەئاگایی ئەم شاعیرە گەورەیەیە.

دەگەڕێینەوە سەر باسەکەمان: باسی گەورەیی مەولەوی لە شیعرێکدا بە دەرخستنی جوانی بەهاری کوردستان لە دوا مانگی بەهاری ناوچەی سەرچاوەی زەڵمدا مەولەوی ئەفەرموێ:

وەهاران سەیرەن سەوزەی دیاران
نم کەوت نەیدەش چوون شەو بێداران
چوون دێوانەی شۆر ئازیز نەسەردا
شەتاو سەر هۆر گرت وەی دەشت و دەردا
پەی دڵەی مایناى دەروون مەلاڵان
سایە وەستەوە خەیمەی گوڵاڵان

(وە هارەن سەیرەن سەوزەی دیاران) کە نیوە دێڕی شیعری یەکەمی سەرەوەیە:

ئەفەرمووێ: بەهارە، سەیرانە، وردە گیا سەوزەکانی تەنیشت قوڵپە بەفرینەکەی سەرچاوەی زەڵم کە هاژە و هاڕەی بەربوونەوەی تاڤگەکە ئەکەوێتە دامێن پریشک و دڵۆپە ئاو بەم لاو بەولادا وا دەهاڕێ ورد ورد دەنیشێتە سەر وردە سەوزەکانی ئەملاو ئەولای شارەکە، بەهارە سەیرانە سەوزەی ئەمبەر و ئەوبەر لە گوێ سەرچاوەی زەڵم کە تازە ڕۆژهەڵهاتووە. گزنگی هەتاو نیشتۆتە سەر دڵۆپە ئاوەکانی کەپرژاوە بەسەر چیمەنی گوێ قەراغ تاڤگەکە دا لە (چاوی ئینسانێکی خەو لێ نەکەوتووی بێداری دەرد و دوو داری سزاواری ئازار لێ نیشتووی دەم بەهاواری دەردی سەری هەژاری و نەبوونی و بیرکەرەوە لە ئازاری مرۆڤەکانی دوور وڵاتەکەی ئەچێ کە لەسەر ئەو دەردەسەری و ژانە بێدارە و خەوی لێ نەکەوتووە تا بەیانی، دڵۆپی فرمێسک ڕژاوەتە چاوی و هەر فرمێسک ئەڕێژێ. جوانی بەیانیانی سەرچاوەی زەڵمی کە دڵۆپە ئاوەکانی تاڤگەکە ڕژاوەتە سەر چیمەنەکەی دەور و پشت. شوبهاندووە بەچاوی ئینسانێکی شەکەتی ئازار و ژانی تا بەیانی خەو لێ نەکەوتووی مرۆڤێکی ئەم وڵاتە.

لە شیعری دووەمدا ئەفەرمووێ:

(چوون دێوانەی شۆر ئازیز نەسەردا) وەکو دێوانەیەکی حاڵ لێ هاتووی تا نیوە شەو زکرکەر بێ کە سەودا و شۆر و عەشقی ئازیزەکەی کەوتبێتە سەری خەوی لێ نەکەوتبێ لە خۆراک دوور کەوتبێتەوە وەک دێوانەیەکی سەودای ئازیزی لەسەر دابێ چۆن کە حاڵی لێ بێ سەر ئەکێشێ بەم بەرد و ئەو بەردا بەم دیوار و بەو دیواردا بەو جۆرە وەک دێوانەیەکی حاڵ لێ هاتووی ئازیزەکەی چۆن ڕا ئەکات و خۆی ئەدا بەم بەرد و ئەو بەردا. بەو جۆرە (شەتار سەر هۆرگرت وەی دەشت و دەردا) بەو جۆرە ئاو تاڤگەکە کە دەڕژێتە خوارەوە خۆی ئەکێشێ بەو بەردا خۆی ئەدا بەم قەد پاڵەدا، بەو قەد پاڵەدا هەتا وردە وردە ئەگاتە پێدەشت. دووبارە لەم شیعرەشدا شاعیری گەورە هاتنە خوارەوەی تاڤگەی زەڵمی شوبهاندووە بەمرۆڤێکی حاڵ لێ هاتووی ئازیز و خۆشەویستەکەی کە خۆی بۆ ئەکێشێ بەم بەر و بەو بەردا (ئەم خۆشەویستی و حاڵ لێ هاتنە یەزدانییە مرۆڤایەتییە نەتەوەییە، چینایەتییە) کە ئەتوانین بەو هەموو جۆرە ئەم شیعرە لێک بدەینەوە. ئەتوانین بڵێین تاڤگەکەی تەرخان کردووە کە دێتە خوارەوە کە دەچێتە پێدەشت بۆ لاسایی کردنەوەی مرۆڤە ئازار دیوەکان، مرۆڤە ستەمدیدەکان مرۆڤە شەو بێدارەکان لە ئازاری دڵ. لە شیعرەکەی تریشدا دەفەرمووێ (پەی دڵەی ماینای دەروون مەلاڵان) کە تاڤگەی سەرچاوەی زەڵم لەم بەرد و لەو بەرد ڕزگاری دەبێ لەخۆکێشان بەم قەد پاڵ و بەو قەدپاڵەدا تا دەگاتە پێدەشت ڕۆیشتنی تۆزێ لەسەرخۆ دەبێتەوە لە



باخەکانی ئەحمەد ئاوا دەردەچێ سەرەو خوار بەرەو ئەو دەشتە دەکەوێتە ڕێ. لە بەهاردا پەڵەی گوڵاڵە سوورە ناو ئەو وەردەی داگیر کردووە لە سەر هەر کۆسپێک پەڵەیەکی دیارە. لە هەر قەدپاڵێکی بچووکدا چەند پارچەیەکی دیارە دووبارە ئەفەرمووێ: (سایە وەستەوە خەیمەی گوڵاڵان). بۆ ئەو دڵانەی کە ماندووی ئازارن، بۆ ئەو دڵانەی کە هیلاکی دەردی سەرین، بۆ ئەو دڵانەی کە ڕەنجکێشی شەو و ڕۆژن، بۆ ئەو دڵانەی مەلال و ئازار و ئیش و ژان دەروونی توێ توێ کردوون، دەروونی پڕ برین و پڕ قەتماغە کردوون. بۆ ئەو دڵە ماندووانە، بۆ ئەو دڵە پڕ ئازار و ئێشانە، ئەم پەڕە گوڵاڵە سوورانە دەرهاتووە، گەشاوەتەوە بۆ ئەوەی سێبەر بۆ ئەو دڵانە بکات. گەشانەوەی گوڵاڵە سوورە لە هەموو کونج و پەناو گردێکی ئەم وڵاتەدا بۆ سێبەر کردنە دڵە هیلاک و ماندووەمانە، لە دڵە ئازار دیوەکان لە دڵە بریندار و خوێن لێ ڕژاوەکان. جا ئیتر ئەو دڵە ئازار دیو و بریندار دیو و خوێن لێ ڕژاوانە لەناو خۆدا وایان لێ هاتووە یان لەناو ئازاری چەوساندنەوە وای لێ هاتووە یان لە قار و ئازاری دەردی سەری چینایەتی وایان لێ هاتووە گوڵاڵە سوورەکان بۆ ئەو دڵانە سێبەریان کردووە گەشاوەتەوە، پشکووتوون.

شاعیری گەورە مەولەوی لە گەورەییەکی تری شیعردا کە بەپێشەنگێکی گەورەی کۆمەڵایەتی دائەنرێ بەچارەسەرێکی گەورەیی چەڵەمەکانی ژیان و ڕێ ڕۆیشتنی ژیان دائەنرێ ئەبێ لەسەرخۆ بکەوێتە سەر ڕێی شیکردنەوەی دەرخستنی ئەم قەسیدە بەرزەی تری شاعیری گەورە. مەولەوی، ئەفەرمووێ: پێش ئەوەی بێینە سەر باسەکە ئەبێ بڵێین:

ئێمە لێرەدا ناچارین بۆ زیاتر ڕوون کردنەوە و بۆ زیاتر تێگەیشتن لە گەورەیی ئەم شاعیرە پەنابەرینە بەر (ڕۆحی مەولەوی) کە شاعیری گەورە پیرەمێرد وەری گێڕاوەتە سەر شێوەی سلێمانی هەر چەندێک ڕاستە و ڕاست شێوەکە وەرنەگێڕدرابێت وە تەواوی نەتوانرابێت شیعرەکانی بگێڕدرێتە سەر شێوەی سلێمانی بەڵام تا ڕادەیەک پیرەمێرد توانیوێتی زۆر خاوێن وەستایانە بیگۆڕێت.

ئەفەرمووێ:

هەر بیری بەختی ڕەشی خۆم ئەکرد
ئەم وت بۆچ منی وا بەم دەردە برد
هەرچی ئەبینم وا لە بەزمایە
دەستی لە سینەی گەرم و نەرمایە
سواری ئیقبالن وان لەپێشەوە

من بەدەست چەرخی جەفاکێشەوە
ناڵەم سازمە خەم بادەی بەزمە
هەروا مامەوە لەم پایە نزمە
گینگلّم ئەخوارد بەدەردی پەنهان
پارچە بلووریّ لیّم هاتە زمان
وتی لەوساوە بەبەرد خەلق کرام
هەچ کەسیّ هات و پێیەکی پیانام
ڕۆژیّ هێنامیان دوو بۆرە زەلام
نامیانە ناو بەر چەکوشیان دام
هێندەیان لیّدام هەتا بووم بەئارد
نامیانە کوورەی ئاگر جۆشم خوارد
کە قاڵیان کردم بووم بەبلووریّ
ئەدرەوشامەوە وەک پارچە نووریّ
لەو بەردە ڕەشە بووم بەو بلوورە
شەرارەی کوورە
تا دەوران چەکوش نەدا بەسەرتا
بەرگی تەسلیمیی نەکا بەبەرتا
بەختت ناپوختە بەرقی بیّ نووری
لە ڕێی تەجروبە و دووربینی دووری

شیکردنەوەی ئەم قەسیدە بەرزەی شاعیری گەورە بەچەند لاپەڕەیەک تەواو نابێت، تەماشاکردنی ئەم (موضوعە) بەتەنها داستانی تێکۆشانی بیّ وچانی ئادەمیزادە لەڕێی گەیشتنە سەودای دڵ و دەروون و بڕوا و مەبەستیدا (موضوعی) ئەم قەسیدەیە بیرکردنەوەی مرۆڤێکی ژیان ڕەشە، گوزەران ڕەشە، ناوچەوان ڕەشە، کە شەو و ڕۆژ بیری لەبەختی ڕەشی خۆی کردۆتەوە بۆیە ئەفەرمووێ:

هەر بیری بەختی ڕەشی خۆم ئەکرد
ئەم وت بۆچ منی وا بەم دەردە برد

مرۆڤێکی چارەڕەش بیری لەبەختی ڕەشی خۆی دەکردەوە ژیانێکی ڕەش، گوزەرانێکی ڕەش، چارەنووسێکی ڕەش.



پرسیاری ئەکرد لە کردگار لە ڕێکەوتی ژیانی ئەی وت: من بۆچی بەم دەردەچووم؟! بۆچی من ئەمە ئەنجاممە؟ من بۆ بەم دەرد و ئاواتە چووم؟ بۆچی من لە خەلق کەم ترم؟ بۆچی من زیندەوەر نیم؟ بۆ، بۆ، بۆ؟ چاو ئەگێڕم هاوڕێکانم دراوسێکانم ئەوەی من دەیانبینم لە شادی دان لە خۆشی دان، لە تێری دان، لە تەسەلی دان، هەر چ ئەبینم لە هەڵپەرکیّ دایە، دەستی لە سینەی گەرم و نەرم دایە سواری ئیقبالی خۆی بووە، گەیشتۆتە ئامانجی خۆی، بەرەو پێشەوە ئەڕوات، لەپێشەوەیە، چارەنووسی خۆی دەستکەوتووە، دراوسێکانی بەجیّ هێشتووە، لە شادی دایە لە کامەرانیایە، لە خۆش بەختی دایە. کەچی من بەدەست چەرخیّ زەمانەوە بەدەست چەرخیّ کە لە ئازار بەولاوە لیّم نەدیوە کە لە دەردی سەری بەولاوە پیشانی منی نەداوە شەو و ڕۆژ هاوارم مۆسیقامە خواردنەوەی بەزم و ڕابواردنم بریتییە لە خەم خواردن، فەریاد و دەستدرێژ کردن و هەوڵ و تەقەلا بۆ من بریتییە لە هاوار هاوار و لە خەم و زووخاو خواردن. سەرەڕای ئەم هەموو دەردی سەریە ئا لەم پایە نزمەشدا مامەوە سەرەڕای ئەم دەردی سەریە هەروا دواکەوتووم. خۆم لەگەڵ دڵی خۆمدا دەستم کرد بەلێکدانەوە بەپێچ خواردن بەگینگڵ خواردن بەدزییەوە بەخۆمم ئەوت چی بکەم بەرەو کویّ بڕۆم؟، لەپڕ پارچە بلوورێکم لیّ هاتە زمان، پەرداخە شکاوێکم لیّ هاتە قسە، پارچە پەرداخە شکاوەکە وتی: من لەپێشدا لە بەرد خەلق کرام و بەرد بووم بەئاسانی تێت بگەیەنم من پارچە بەردیّ بووم ئەم ئەهات شەقێکی تیّ هەڵئەدام ئەو ئەهات پێیەکی لیّ ئەنام لەپڕ ڕۆژێک دووبارە زەلامم لیّ پەیدا بوو هەڵیان گرتم و لەسەر بەردێکی تر دایان نام، دامیانە بەر چەکوش، ئەوندەیان لیّدام تا بووم بەخۆڵ وەک ئاردم لیّ هات تا بەو جۆرە ورد بووم، فڕێیان دامە ناو کوورەی ئاگرەوە تا لە کوورە ئاگرەکەدا جۆشم خوارد پاش جۆش خواردن پاش سووتان پاش ئەنجامی دەردی سەری و ئازارچێشتن قاڵیان کردم، خستمیانە ئاوێکی ساردەوە کە هاتمە دەریّ بووم بەپارچە بلووریّ، ئەدرەوشامەوە وەک پارچەیەکی جیابووەوە لە ڕۆژ. لەو بەردە ڕەشە، لەو بەردە ڕەقە پاش قاڵ کردن، پاش وردکردن پاش هاڕین کە خرامە ناو کوورەی ئاگر جۆشم خوارد بووم بەو بلوورە، بووم بەو پەرداخە جوانە لێوم نا بەلێوی نازدارانەوە کەوتمە بەزمی خەم خوارانەوە ئەم دەست و ئەو دەست دەیان فڕاندم، ئەبرام بەئەملاو ئەولادا.

لەو بەردە ڕەشە بووم بەو بلوورە. تا دەوران تا زەمانە چەکوش نەدا بەسەرتا بەرگی قاڵ کراویی نەکا بەبەرتا بەختت پاک نییە، بەختت ڕووناک نییە برووسکەیەکی ڕووناکیت نییە لە ڕێی تاقیکردنەوەی ژیان دووریت مرۆڤێکی دووربین نیت و دوور تریش ناڕوانیت!.

ئەم قەسیدە بەرزەی مەولەوی کتێبێکە (کۆمەڵایەتییە، ڕامیارییە، خواپەرستییە، زانینە، فێربوونە).

***

## چۆن ئەدەبی کوردی دراسە بکەین؟[1]

چۆن ئەدەبی کوردی دراسە بکەین یا ڕاستتر چۆن شیعری کوردی دراسە بکەین؟

ئەوەی ئاشکرایە هەتا ئەم کاتە ئەدەبی کوردی بە(مەفهومی) دراسە کەسێک نییە و نەبووە «دراسەیەکی شامل و عیلمی» شیعری کوردی کردبێ. بەڵێ شیعری کوردی «ترجمە» کراوە بۆ چەن زمانێکی بێگانە چەن (تعلیقاتێکی) لەسەر دراوە، جۆرەها ڕەئی بەرامبەری وتراوە، هەندێ ئەڵێن ئەدەبی کوردی دواکەوتووە هەندێ ئەڵێن ئەدەبی کوردی پێش کەوتووە، هەندێ ئەڵێن جارێ باش ساغ نەبۆتەوە کامیانە، پێش کەوتووە یا دواکەوتووە؟!

گومانی تێدا نییە کە ئەدەبمان هەیە و ئەدەبەکەمان پێویستی بەلێدوانە. بەڵام کە هاتینە سەر لێدوان ئەبێ بەچە معیارێک بێین هەڵی سەنگێنین و ڕای بەرامبەر بدەین. ئایا (خصائص و ممیزاتی) شیعر و زمانی عەرەبی بکەین بە«معیار»ی شیعر و زمانی کوردی؟ مەسەلا کە پارچە شیعرێکی شاعیری هەرە گەورەی کورد (مەولەوی)مان هێنا سەر دەسگای شیکردنەوە هەموو دراسەکەمان بریتی بێ لەوەی (ئەم شیعرە نەزاکەتێکی تێدایە ئەوی تریان) فەنی بەدیعی تیا بەکار هاتووە ئەوەیان بەلاغەیە ئەمی تریان جناس و تەوریەیە ئەمە لەف و نەشری مشەوەشە ئەوەیان مورەتەبە ئەوە فەنی بەیانە، دەی، دەی هەتا هەموو شیعرەکان ئەبێ بەنەشرەیەکی دەنگوباسی تەرجەمەکراو بەنیسبەت معیاری خصائص و ممیزاتی شیعری کوردییەوە یا کە هاتوو هاتیتە سەر کێش و قافیە لە دەرگای ڕەخنەگرتنا بلێیی ئەم شیعرەیان بەمفاعل فعلات و... ئەوی تریان بەمفاعل فعلات... کورت دێنێ لەنگە، خوارە،...

مامۆستا گۆران لە پێشەکی کۆمەڵە شیعرەکەیدا (بەهەشت و یادگار) ئەڵێ: تا بۆ دوا جار وازم لە «عروض» هێنا و «هیجا» شێوەی پەنجەم کرد بەکێش بۆ داڕشتنی هەڵبەست چونکە ئەم جۆرە لەگەڵ خصائص و ممیزاتی کوردیدا باشتر ڕێک ئەکەوێ. گۆران بۆچی ئەڵێ: (تا بۆ دوا جار وازم لە عروض هێنا) چونکی زمانی کوردی کە

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارەکانی (١٦٨٣، ١٦٨٤، ٨٥، ٨٦، ٨٧، ٨٨) ٩٦٢/٧/٥ یەکەم بەش.



شیعری کوردی پێ ئەوترێ جیاوازە و جیایە لەگەڵ ئەو خصائصانەدا کە زمانە دراوسێکان هەیانە بیئەی کوردستان کە جوانی سروشتی باش تێدا ئەبینرێ (مەڵبەندی ئیحایە بۆ ڕۆمانتیک).

ڕۆمانتیک لە ئەدەبی کوردیدا: نووسەری گەورەی جیهانی (ستیڤان زڤایج) لە دیراسەیدا بۆ تۆلستۆی ئەڵێ:

(لە کەلەبەری ژوورێکی تاریکەوە ئەڕوانمە چیایەکی ڕووناکی بەرز، چونکی ئەو زرووفەی کە تۆلستۆی تێدا هەڵکەوت و ئەو قۆناغە چینایەتیەی کە تۆلستۆی تیا ئەژیا و ئەو قاڵبەی کە ئەدەبی ڕوسی تێدا مەیی بوو مەگەر هەر ئەو هەڵکەوتبێ بۆ ئەوەی ئەدەبی ڕوسی بگەێنێتە لووتکە، مەبەست لەوەیە لە کاتێکا شیعری کوردی کاسی شیعرەکانی سەعدی و نیزامی بوو مووی عەروز خەریک بوو قوڕگی دائەبڕی، مەولەویمان تێدا هەڵکەوت کە ئەبێ لە کونی دەرزییەوە تەماشای ئەو کێوە گەورە ڕەنگاوڕەنگەی بکەین. ئەم پێشەکییە خێرایە ئەوەمان ئەداتە دەست کە ئەگەر هات و هاتینە سەر باسی شیعری کوردی و شیعری مەولەیمان کرد بەکەرەسەی لێدوان چار نییە و ئەبێ شیعری کوردی لە (نطاقی أقلیم)ی لە خصائص و ممیزاتی عیبارە بێ لە خصائص و ممیزاتی شیعری عەرەبی بیگوێزینەوە بۆ نطاقی جیهان وە مەسەلەی لێدوانی زۆر قووڵترە بەئەمە (تەشبیهێکی جوانە) یا بەسەر ڕاوەشاندنێک دوایی بێت.

***

## مەولەوی و ڕۆمانتیک

ژمارە تایبەتییەکەی (هیوا) کە بەبۆنەی نەورۆزەوە دەرچووبوو لەبەر دەسمایە و قەسیدە بەهارییەکەی مەولەویم جارەها خوێندەوە کە ئەڵێ:

وەهارەن، سەیرەن، سەوزی دیاران
نم کەوت نەدیدەش چون بێداران

مانا ڕووکەشییەکەی: بەهارە، سەیرانە سەوزەی قەدپاڵی شاخەکان کە بەیانیان گزنگی هەتاو ئەکەوێتە سەر شەونمی گیاکان لە چاوی یەکێکی شەو بێداری خەو لێ نەکەوتوو ئەچێ کە بەیانیان فرمێسک زابێتە چاوی. ئەگەر هات و نم کەوت نەدیدەش چون شەو بێداران بە(معیاری)(تشبیە) لێک درایەوە ئەوە شیعرەکە مجرد و ڕووت و سادە دێتە بەرچاو و گوێ، بەڵام سەرنجێک لە شاخەکان لە مانگی (گوڵان)دا کە مێرگی قەدپاڵەکان شەونمی کەوتۆتە سەر و گزنگی هەتاو بریقە و ورشەنی پێ پەیدا

کردووه له چاوی شەوبێدارێک ئەچێ که فرمێسک زابێته چاوی لەبەر بێ خەوی. کام شەو بێدار؟ (شەو بێداری ئازاری دڵ، ئازاری چەوساندنەوە، شەو بێداری دەرد و مەینەتی ، شەو بێداری بەئاوات نەگەیشتن... هتد). لێرەدا بەلای کەمەوە سێ (سبب) دێتە بەردەستمان که بۆچی شەو بێدارە؟

یەکەمیان: (ناحیەی انسانی) که چەوساندنەوەیە دووەمیان: ناحیەی طبقی که دەرد و مەینەتە، سێیەمیان: اجتماعی که بەئاوات نەگەیشتنە ئەمە بێجگە له عاملی ترس له خودا و وجدانیەت. جوانی سروشت تێکەڵ کردن بەهونەری شیعر ئەبێ بە(ابداع) که ئەمەش ڕاستە و ڕاست ڕۆمانتیکە له شیعری کوردیدا.

لەژێر ناونیشانی فەلسەفەی پیرەمێرد چەند جارێک ئەم شیعرەم خوێندۆتەوە که له سەرەتاوە ئەڵێ:

ئەبێ بەخشندە مل کەچ کا له ڕاستی موچەخۆری خۆی

سوراحی بۆ پیاڵە سەر فرۆدێنێ کە تێکا بۆی

(پوشکێن) شاعیری بەناوبانگی ڕوسی له یەکێ له پارچە شیعرەکانیا بەرامبەر بەقەیسەر هونەرێکی سەیری بەکار هێناوە. ئەگەر ئەو چەن شیعرە وەکو دێڕ بخوێندرێتەوە هەمووی مەدحە و ئەگەر «أفقی» بخوێندرێتەوە هەمووی زەمە بۆ قەیسەر. بۆچی پوشکێن ڕاستە و ڕاست نەهاتووە سەر و گوێلاکی قەیسەر بکوتێتەوە که قەیسەر نموونەی ستەم و جەور بوو؟ چونکی قۆناغی ئەوسای ڕوسیای قەیسەری و جۆری بیرکردنەوەی پوشکێن بەرامبەر بەشیعر و چۆن وتنی شیعر بەنیسبەت ئەو سەردەمەوە لەگەڵ نەوعیەتی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانەی که بەئاشکرا پوشکێن شیعری تێدا بڵاو ئەکردەوە لەوە زیاتر نەی ئەتوانی بچێتە ڕادەی ڕووداوەکانەوە لەبەر ئەوە ماوەیەکی زۆر له ژیانی شیعری پوشکێن بریتییە له شیعری ڕەمزی له ژیانی کوردەواریشدا ماوە (قۆناغ) هەیە شاعیرەکانمان کوتومت نەیان توانیوە بچنە ڕادەی ڕووداوەکان (مستوی لاحداث)ەوە لەبەر چەن هۆیەک یا ڕۆژنامە و گۆڤارەکان لەوە زیاتری پێ نەکراوە وە یا شاعیرەکە زیاتری بەڕاست نەزانیوە ڕمی توانج و تانە و ڕەخنە ئاڕاستەی بەرامبەرەکەی بکا. لەبەر ئەوە ناچار بووە پەنا بەرێتە بەر ئەدەبی (ڕەمزی) ئەدەبی ڕەمزی و شیعری کوردی.

مامۆستایانی ڕێبازی ڕیالیزم له شیعردا ڕاستەوخۆ نەهاتوون ئەدەبی ڕەمزی پێشێل بکەن. بەپێچەوانەی ئەوەوە کە هەندێ له خوێندەواران تێی گەیون. مامۆستاکانی ڕێبازی ڕیالیزم «مدرسەی واقیعی» هێرش ئەبەنە سەر شیعری ڕەمزی له کاتێکا توانا



هەبێ ڕاستە و ڕاست بڵێی، بۆ خەڵک بنووسیت، له کاتێکا هێرش ئەبەنە سەر ئەدەبی ڕەمزی کە ئەو جۆرە شیعرە خەڵک ڕابکێشێ بۆ لای خۆی و خەڵک له ئەدەبێکی جەماوەری ئاڕاستەکار دوور بخاتەوە. بەڵام له کاتێکا لەسەر (جووڵەی موو، خرتەی دان) خەڵک ئازار بدرێ وە خاوەن پێنوس نەتوانێ خۆی ڕابگرێ و جۆرە بیرکردنەوەیەکی دیاری کراویش ڕای بکێشێ بۆ خۆڕانەگرتن ناچارە پەنا ئەبا بۆ چەن جۆرێ له شیعری ڕەمزی وە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ ئەچێتە ڕادەی ڕووداوەکان وەکو لەپێشەوە وتمان چەن جارێ له ڕۆژنامەی ژیندا لەژێر «عنوانی» فەلسەفەی پیرەمێرددا ئەو قەسیدە بڵندە بڵاوکراوەتەوە. لێرەدا دوو شیعری ئەو قەسیدەیە ئەگرین و ئەیهێنینە سەر دەسگای لێدوان:

لقی شۆڕی درەخت میوەی ئەخۆن بێ ئەرکی بەرد و دار

پەلی بەرد بۆ پەلی بەرزە لەقەیشە بۆ لقی بەردار

ئەگەر هات و لق و درەخت بەرد و دار، پەل و پەل ، لەقە و لەق، هاونیشتمانە باوەش «تطابق» لەگەڵ «خصائص»ی شیعری عەرەبیدا ئەبێ بڵێین پیرەمێرد له (محناتی لفظی) بەولاوە جۆرە هونەرێکی تری بەکار نەهێناوە بەڵام ئەو درەختانەی لقیان شۆڕە پێویست بەبەرد و دار ناکات تێی گری و هەر سووک و ئاسان دەستی بۆ بەرە و میوەکەی بکەرەوە ئەو کەسانەی که سەرشۆڕ و مل کەچن له ژیانیانیا وەتووشی دەردەسەری و ئازار نابن و بەرد و داریان بەرناکەوێ وەکو لقی شۆڕی درەخت وان که بێ ئەرکی بەرد و دار دەس بەرە بەرەکەی بچنە!

(ضربه) هەر بۆ ئەو ئینسانانەیە که پەلییان بەرزە، سەرکەشن، مل ڕەقن، بەرز و بڵند ئەڕۆن له خەباتا لەبەر ئەوە لەقە «طبیعی» بەر ئەوان ئەکەوێ. بەرد و داری ئازاردان و ستەم و جەور هەر بەر ئەوان ئەکەوێ. بەر ئەو کەسانە ئەکەوێ که بەریان هەیە بۆ نەتەوەکەیان شیعرێکی تری ئەو قەسیدەیە ئەڵێ:

ئومێدی لەسەر دەرکەوت ئەوانەی ڕاست و ڕووناکن

قەڵەم هەر سەر قەڵەم مۆم بۆ مقەست هەر بۆ ئەوەش چاکن

ئەگەر هاتوو دووبارە ئەم شیعرە بەمعیاری شیعر و سیفاتەکانی شیعری عەرەبی وەرگیرا ئەبێ بڵێین: بێجگە له (محسناتی لفظی و نشری مرتب) بەولاوە هیچی تری تێدا نابینرێ.

بەڵام: ئومێدی سەر لەسەر دەرکەن ئەوانەی ڕاست و ڕووناکن – ئەو کەسانەی ڕاستن له ژیانا لەگەڵ نەتەوەکەیانا له تێکۆشانا و ئەو تێکۆشانە ڕووناکییە بۆ ڕێگای

بەئاوات گەیشتن و ڕووناکی ئەدەن بەدەور و پشتیان وەکو (قەڵەم و مۆم) هەر لەسەرەوە دائەدرێ و ئەقرتێنرێ. قەڵەم هەر لەسەرەوە دائەدرێ و مۆمیش هەر لەسەرەوە ئەقرتێنرێ. لەبەر ئەوە ئینسانە ڕاست و ڕووناکەکان ئەبێ بەتەمای (سەر) نەبن بەتەمای ژیان نەبن ئەبێ خۆیان ئامادەکەن بۆ مردن لەپێناوی ڕاستی و ڕووناکی بۆ گەلەکەیان، هەر بۆ ئەوەیش چاکن.

لێرەدا ئەوپەڕی «تضحیە» لەم دوو سێ وشەیەدا ئەبینرێ مۆم ئەبێ بسووتێ بۆ ڕووناکی قەڵەمیش ئەبێ دابدرێ بۆ نووسین، ئینسانە ڕاستەکان هەر ئەبێ ببن بەقوربانی و ڕووناکەکانیش ئەبێ بسووتێن بۆ ئەوەی تاریکی مەڵبەندەکەیان ڕووناک بکەنەوە. ئەم شەرحە سەر پێییە ئەمانبات بۆ ئەوەی جوانترین شێوەی شیعری ڕەمزی[1] مان بەر دەستکەوێ لە شیعری کوردیدا.

لە دوو ژمارەی ڕابردوودا یەکەمیان هەوڵێک بۆ گواستنەوەی شیعری کوردی بۆ ڕیزی ئەدەبی جیهان و تاقە شیعرێکی قەسیدەیەکی مەولەویمان بۆ نموونە هێنایەوە. دووەمیان هەوڵێک بوو بۆ بەراوردکردنی شیعری کوردی لە بارەی وردی قووڵی ماناوە هونەری شیعری و داڕشتنی ڕێکوپێکی زمان و (ئسلوب) لەگەڵ ئەدەبی تری جیهاندا. مەبەستمان لە بەراورد کردن و هەوڵ دان بۆ گواستنەوەی شیعری کوردی لە ئەدەبێکی ناوچەییەوە بۆ ڕیزەی جیهان ئەمانەوێ سێ چوار بخەینە ڕوو.

یەکەم: ڕزگار کردنی شیعری کوردی لە خصائصی شیعری عەرەبی مانای چی، یانی بیسەلمێنین کە شیعری کوردی دواکەوتوو نییە. دواکەوتوو نییە نەلەبارەی ئوسلوبەوە نە لەبارەی داڕشتنەوە «سبک». نەلەبارەی نیازەوە «غایە». نەلەبارەی زنجیری فکریەوە.

دووەم: بیسەلمێنین کە لە شیعری کوردیدا «تدرج» هەیە. یانی چی؟! لە دەست پێکردنی قەسیدەکەوە تا تەواو بوون شیعر لەگەڵ شیعر سەرکەوتن لە هونەری شیعری و ئامانجی شیعر و هۆنینەوە لە مەبەستا وەڕاکێشانی خوێنەر بۆ ناوەڕۆکی بابەتی شیعرەکە.

داستانەکەی مەم و زینی خانی بەرزترین شێوەی «تدرج»ە لە دەست پێکردنەوە کە بەستایشی خودا دەست پێ ئەکا و کوردایەتی ئەکا بەپێشەکی بابەت و ڕۆژی نەورۆز ئەکا بەڕۆژی بەیەک گەیشتن هەتا ئەڕوا هەر سەرکەوێ هەتا ئەگاتە لووتکە. تا دێت لە

(١) وە نەبێ پیرەمێرد بەشاعیرێکی ڕەمزی لە قەڵەم بدەین چونکو پیرەمێرد لە مەجالێکی تردا باس ئەکەین بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو دوو شیعرە جوانترین شێوەی شیعری ڕەمزییە بۆیە هێنامانەوە.



هونەری شیعر و ئوسلوب و مانا و وردەکاری و داڕشتنا هەر سەر ئەکەوێ تا تەواو ئەبێ.

سێیەم: بیسەلمێنین کە بابەتەکانی ئەدەبی جیهان (کلاسیک، دراماتیک، ڕۆمانتیک، ئیلتیزام، واقعیەت) لە شیعری کوردیدا نەک هەیە بەڵکو بەزیادەوە تیادا دەرئەکەوێ.

چوارەم: بیسەلمێنین کە لەبارەی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتییەوە بەو ئیعتبارەی کە شیعر دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە هاو هەنگاوی قۆناغەکانی کۆمەڵایەتی کوردی کردووە وەکو نەتەوەکانی تری جیهان. بۆ نموونە لە یەکەم دەست پێکردنی بزووتنەوەی نیشتمانی کوردەوە تا ئیمڕۆ شاعیرمان هەیە زۆر باش لەگەڵ ڕووداو و شۆڕشەکان ڕۆیشتووە و شیعرەکانی تا ئێستاش بەستەی سەردەمی ئەم خەڵکەیە وەکو (بێکەس، پیرەمیرد) جا ئەگەر هات و توانیمان بیسەلمێنین کە شیعری کوردی ئەو لایانەی تیادا هەیە وەکو وتمان ناچارین بیگوێزینەوە بۆ ڕادەی جیهانی وە مەسەلەی دراسەکردنی ئەبێ بەمەسەلەی ڕزگارکردنی لە سیفەتەکانی شیعری عەرەبی. لەپێشەوە وتمان: بیسەلمێنین کە دواکەوتوو نییە.

وە سەلماندنمان کە دواکەوتوو نییە و ڕزگارکردنی لە سیفاتەکانی شیعری عەرەبی مانای ئەوە نییە شیعری عەرەبی دواکەوتووە. نەخێر، بەپێچەوانەوە مانای ئەوەیە خوێندەوارانی کۆن و تازەش هەندێکیان کە هاتنە سەر لێکدانەوەی شیعری کوردی دێن بەتەرازووی سیفاتەکانی شیعری عەرەبی شیعرە کوردییەکە لێک ئەدەنەوە. وەک وتمان ئەمە. جناسە، ئەمە تەوریەیە، مانای ئەوەیە خاسیەتەکانی زمان و شیعری عەرەبی ئەوەندە زاڵە بەسەر ڕۆشنبیری و شیعری هەندێ لە شاعیرە کۆنەکانماندا هەچ شیعرێک هاتە سەر دەسگای یەکالاکردنەوە خێرا یەکێ لە سیفاتەکانی شیعری عەرەبی ئەدرێتێ.

وتمان شیعری کوردی دواکەوتوو نییە بەتایبەتی لە بارەی ئوسلوبەوە. چۆن؟ حەمدی ئەڵێ:

سوبح پێ ناکەنێ تا بێ نەوایە شەو بەدڵ نەگری
گوڵێ ناپشکوێ تا بولبولی سوبحێ بەکوڵ نەگری

توازن لە نێوان شەو لەپاشا ڕۆژ، گوڵ و بولبول، گریانی بولبول بەدیار گوڵەوە بۆ ئەوە سەر لە بەیانی یەک دوو دڵۆپ عەتر بڕژێ، فەرامۆش کردنی لەبەری بەیانا و بەئاگا هاتنی کە گزنگ هەڵات و عەترەکە با بردی دووبارە توازن لەمیان بێ نەوایە، ناکامی، بەئاوات نەگەیشتوویە تا بولبولی پاش عەتر بابردن بەکوڵ نەگری گوڵێ ناپشکوێ، تا

گریان نەبێ هەرچەندە گریان لێرەدا بەڕووتی وەرناگیرێ گریان مەبەست لەتەقەلایە لە کۆششە لە توانەوەیە بۆ ئەوەی ڕۆژ هەڵبێ بۆ ئەوەی سەرفرازی کە ڕووناکییە بێتە ناوەوە.

تا بێ نەوایەک نەگری «صبح» هەڵ نایەت، تا بولبولێ نەخوێنێ لە خوێندنەکەی نەگرێ گوڵ ناپشکوێ. تا دەنگدارەکان خاوەن زمان و بیروڕا نەکەوێتە ناوەوە نەڵێت، تا ڕێ و شوێن دانەنێت، وتمان هاوکێشەیی لە نێوان شەو و ڕۆژ، تاریکی و ڕووناکی جوانی و بۆ جوانی خوێندن یاخود شادمانی و بەختیاری لەگەڵ دۆزینەوەیدا لەگەڵ دەستکەوتنی ئەم بەرامبەریە ڕەوانتر لە شیعرەکەی تریدا دەرئەکەوێ کە ئەڵێ:

بەری نابێ درەختی باخی عالەم تا هەموو وەک یەک
بەیەک سۆز و بەیەک شۆڕ و بەیەک دەم چل بەچل نەگری

حەمدی مەسەلەی شەو و ڕۆژ و گوڵ و بولبول مەبەستەکەی خۆی بەدەستی خۆی شیعری کوردی لە چوارچێوەیەکی ناوچەییەوە گواستەوە بۆ جیهان؟ چۆن؟

بەری نابێ درەختی باخی عالەم تا هەموو وەک یەک

درەختی باخچەی ژیانی ئەو دنیا فراوانە کە جۆرەها نەتەوەی تیا ئەژی و هەر یەکە خاوەنی زەوی و زمانێک و ئەدەبێک و مێژوویەک و ڕۆشنبیرییەکە و بەتەمان هەر نەتەوەیە وەکو برا بەهاوکاری لەگەڵ یەکدا بەر لە باخی ژیان و بەروبوومی زەویوزار و ئاشتی بخۆن. ئەو درەختی باخە بەری نابێ تا هەموو وەک یەک هیچ نەتەوەیەک دەست بۆ ئەوی تر درێژ نەکا و ئەم بەسووک و ئەو بەقورس نەدرێتە قەڵەم و ئەمبەر ڕەش و ئەوبەر سپی تەماشا نەکرێ و ئەو دڕندە و ئەو مەڕ نەیەتە بەرچاو. تا هەموو وەک یەک تێ ئەکۆشن بۆ بەختیاری بۆ ئازادی بۆ وەک یەکیی. درەختی باخی ژیان سەری نابێ تا: بەیەک سۆز و بەیەک شۆڕ و بەیەک دەم چل بەچل نەگری.

تا بۆ یەک ئامانج بەیەک جۆر دەنگ بەیەک جۆر تێکۆشان تا بەیەک دەم چڵ بەچڵ نەگری. تا بەیەک بیر و تێگەیشتن ئەو لقی درەختی باخە هەوڵ نەدات (لقەکان) کە نەتەوەکانە توازن لە مەراما لە نیازدا لە پارێزگار کردنی وەزن و قافیەدا باشترین شێوە (ئوسلوبە) لە شیعری کوردیدا ئەو دوو شیعرەی کە بۆ نموونە هێنامانەوە. وتمان دواکەوتوو نییە لە بارەی داڕشتنەوە. (سبک) چۆن؟

دووبارە حەمدی ئەڵێ:

بازاڕی دەهرە قیمەتی ئەشیا بەجێگەیە
مێشێ گەیشتە ڕووی نیگارێ لە خاڵ ئەچێ



(داڕشتن) لەلایەن بازاڕ و شتومەک، نیگاری جوان و بەنرخ. داڕشتن لەم شیعرە عەرەبییەدا کە بۆ نموونە ئەیهێننەوە، بیهێنینەوە بەرچاو کە ئەڵێ:

والنير كالتراب ملقى في اماكنه
والعود في ارضه نوع من الحطب

ئاڵتون لە جێی خۆیدا وەکو گڵ وایە داری عودی بۆن خۆشیش لە جێی خۆی وەکو دار وایە. داڕشتن لەلایەن ئەم شیعرە عەرەبییەوە لەیەک وەتەری دیاریکراو ئەدا کە تەعبیرە بۆ مەبەستێکی لەبەر چاو! بەڵام زۆر زۆری لێ زیاد کردووەکە حەمدی ئەڵێ: بازاڕی زەمانەیە نرخی شت بەجێگەیە وەک ئەوەی مێشێ بەدەم و چاوێکی جوانەوە بنیشێتەوە لە خاڵ ئەچێ چونکی جوانی دەم و چاوەکە نرخ بۆ مێشەکەش پەیدا ئەکات.

وتمان دواکەوتوو نییە لە بارەی نیازەوە «غایە»وە نە لە بارەی زنجیرەی بیرەوە چۆن؟ یەکێ لە شاعیرەکانمان ئەڵێ:

بێ تۆ چاو لاڵی بینینە
ئەی خوای ورشە
سەرنج قولانجێ بڕ ناکا
ئەی درەوشە، کزی هێزە
نیگا بێ کێش و بێ پێزە
بێ تۆ ئەی چیایە گزنگ
ئەی دەریایە نمی ئاورنگ
ئەی بەهەشتی ژینی شادی
وەی ئازادی

جارێ لەبارەی یەکێ لە سیفەتەکانی چاوەوە چاو لاڵی بینین لاڵ «ناوی تایبەتە» بۆ زمان، لات بۆ بەژن، کێش و پێز بۆ گەنم و دانەوێڵە لێرەدا لاڵ، لات، پێز بەمجاز وەرگیراوە بۆ چاو بۆ بینین کە ڕەونەقی لێ وردبوونەوە زیاتر دەرئەکەوێ ئەگەر بوترێ (چاو کزی بینینە) ئەگەر ڕاستەوخۆ وترا سادە دێتە بەرچاو لەپاشا چاو لاڵی بینینە لاتیی تینە، کزی هێزە، بێ کێش و بێ پێزە. بۆچی؟ بۆ سەربەستی، بۆ سەرفرازی، تەعبیر لەو چەن وشەی پێشەوەدا بۆ نیازێک کە سەربەستیە ورد و ڕێک هاتۆتە بەردەم. ئنجا بێینە سەر زنجیرەی فکریی - بێ تۆ چاو گۆناکا بۆ بینین ئەی خوای درەوشەو ورشە سەرنج هەر چاو نیگا هەر چاو لە سەرەتاوە بە سێ چوار قۆناغی داڕشتن کە هەر مەسەلە چاوە بۆ ئەوەی لە غایەکەی بگەیەنێ کە ئەو هەموو دەرد و

دووەی بەسەر چاوا دێت لەبەر نەبوونی خوای ورشەیەکە بریتییە لە سەربەستی. لەبەر نەبوونی کێوی گزنگە. ئۆقیانوسێ شەونمە کە بریتییە لە ئازادی. زنجیرەی بیری لەو پارچە شیعرەدا کە بەنموونە هێنامانەوە شێوەیەکی رەونەقداری شیعری کوردیمان ئەداتە دەست. مەولەوی ئەڵێ:

قـوربان قـوربانەن جەژنەن شـادیەن
دەس لە مـــلانەن رووی ئازادیەن

مەولەوی لەم قەسیدەیەدا بابەتێکی گرتووە بەدەستەوە شیکردنەوە و چارەسەریشی بۆ داناوە ئەڵێ: جــەژنی قــوربانە هەندێ دەس لەمــلانن و گــەردن ئازادی ئەکــەن هەندێکیش چاوەڕێن بکرێن بەقوربانی.

مەولەوی ئەیەوێ خۆی ببێ بەقوربانی ئەڵێ:

بیکە وە خـاتر جـەژنی قـوربانە
بمکە وە قـــوربان ئەو باڵا جـــوانە

لەپاشا ئەچێتە دنیایەکی، دنیایەکی تری تەعبیرەوە کە ئەڵێ:

خـۆ بۆ تۆ جـەژنی قـوربانی ئەبێ
بۆ منیش مـــەرگی ئاســانی ئەبێ

لەپاشا بیر ئەکاتەوە کە قوربانی سیفاتی هەیە، یەکەم ئەبێ گەنج بێ، بێ نەخۆشی بێ، دانی نەکەوتبێ، مەولەوییەکی پیری چاو کزی دەردەداری مەینەت و دەرد و دوو دیو و سیفاتەکانی قوربانی لەگەڵدا ناگونجێ کە ئەڵێ:

قـوربانی مـەشـیـو جـەعـەیب بەری بۆ
فـــدای خـــاک پای ڕای دولبـــەری بۆ
تۆ پاشکســـتـــەی بەردی هەردی دەرد
چەم کـوری مـەینەت تەن لاغـر ڕەنگ زەرد

تۆیەکی پێ شکاوی بەردی هەردەی دەرد و دوو مـەینەتی، چاو کوێری دەردی سـەری لاتی نەبوونی ڕەنگ زەردی هەناسـەی ڕەش سـیـفـاتەکـانی قـوربانی چۆن بەسـەر ئەوا ئەچەسپێ.

ئنجا ئەگەڕێتەوە و ئەڵێ:

خـەیاڵت خـامـەن جـەوری نادانی
لای لایق وەتـون ڕوتبـەی قـوربـانی



هەی هو خـەیاڵێکی خـاو ڕوتبـەی کە مـەولەوی خـۆی لە چەن ساڵەوە بۆ ئامادە کـرد بوو، لایەق بەو نین. لە یەکەم شیعرەوە قوربانی قوربانە بۆ جەژن بۆ قوربانی سەر برین خۆ ئامادەکردن. سیفاتی قوربانی نەبوونی لە مەولەویدا و بەناکامی گەڕانەوەی بۆ شارە وێرانەی مەئیـوسی... ئینجا ڕنجیرەی فکر هەر ئەوەندە ئەتوانرێ زاڵ بکرێ بەسەر بابەت «موضوع»یکدا.

وتمان ببیـسـەلمێنین کـە لە شـیـعـری کـوردیدا بابەتەکـانی ئەدەبی جـیـهـان هەیە ئەو بابەتانەی کە بەلایەن جۆرە هاووڵاتی جیاجیاوە سنوور نییە بۆ ئەدەب. بەمانای پارچە شیعرێ یا پەخشانێ یا چیرۆکێکی بەزمانی ئەڵمانی هۆنراوە کە گۆڕایە سەر زمانێکی تری وڵاتەکان ئەو تام و بەرامەیەی کە بەزمانەکەی پێی وتراوە هەمان تام و بەرامەش ئەدات بەو زمانەی کە پێی ترجمەکراوە. بۆ نموونەش بەدواجار دوو بابەتمان خستە پێش چاوی خوێنەدەواران یەکـەمـیـان ڕۆمـانتـیـک، کـە بەسـەرەتای قـەسـیـدەکـەی مـەولەوی (وەهارەن سەیرەن). دووەمیـان ڕەمزی کە بە دوو شیـعری پیرەمێرد لقی شۆڕی درەخت پیشان درا. هەچ نەتەوەیەک گەورە یا بچووک سەربەخۆ یا ژێر دەستە، پێشکەوتوو یا دواکەوتوو کە هاتو خـاوەنی زمـان و زەوی و مـێژوو و جـێگای دیاریکراوی خـۆی بوو، هەچ نەتەوەیەک کە ئیش دابەش کرا تیایدا ئەوە میر، ئەوە گەدا ئەوە شوان، ئەوە ئاغا، ئەوە کاسب، ئەوە... هتد. ئیشکەر یانی کە تێکەڵاوبوونی کۆمەڵایەتی کەوتە کار و بۆ پێشەوە چوون وە هۆی چینایەتی دەستی کرد بەسنوور دانان بۆ بەرزی و نزمی، تێری و برسێتی و دەست گـەیشـتنە شت و دەست نەگـەیشـتنە شـتی خـەڵک بەلایەن ئەدەب و هونەری ئەو خەڵکانەشەوە بابەت پەیدا ئەبێ نەتەوەی کوردیش وەکو نەتەوەیەکی خاوەن قـەوارەیەکی تەواو و دیاریکراوی خـۆی وە لەبەر ئەوەی تا ڕادەیەک نـاکـۆکی چینی لە نێوان دوو دەستـەی دەرەوەی شاری کـوردستـان هەبووە لە شیـعری کوردیدا دراماتیک پەیدا بووە.

هەی سـوار سوار بێ هەی تفەنگچی دەس باتە تفـەنگ
هەی کــچی جــوان ئارایشـــتی خـۆی کـا بۆ ئاهەنگ

لە ژیانی کـوردەواری لادێدا بووک لەم دێوە بۆ ئەو دێ بەتەقـە و ڕمـبـازی و بەزمـەوە ئەبرێ پاش ئەوەی جوانەکان خۆیان ئەڕازێننەوە، بۆچی؟

لەژێر تارای ســورمــەچنا هەرە جــوانی دێ
کچی جوتیار بەرەو کۆشکی ئاغا کەوتە ڕێ

ئەشێ کیژێکی جوان بەبێ ئەوەی بەئارەزوو و ئاواتی خۆی خرابێتە ژێر تارای سورمەچن لە چاوگەیەکی بەتەیمان تەنراوەوە ڕووەو کۆشکێ خرابێتە ڕێ کام کچ؟

کچی جوتیار بۆ بەهەشتی ژین و دڵداری
لەگەڵ کوڕی شوان بەستوی پەیمانی یاری

ئەو کچەی بەپێچەوانەی ئەو جێگا و ڕێگا و ناز و نیعمەتەی کە ئێستێ بۆی ئەبرێ لە زووەوە لەگەڵ کوڕی شواندا پەیمانی خۆشەویستیان بەستبوو کام کوڕ؟

کوڕی شوانی برژاوی ئیش لەبەر هەتاو قاڵ
مەچەک ئەستوور لەش کەڵەگەت دەفەی ناو شان چاڵ

لێرەدا گۆران چەوساندنەوەی چینایەتی زۆر باش دەرخستووە کوڕی شوانی برژاوی ئیش کە ڕۆژ هەتا ئێوارە بەبەفر و بەباران بە با بەگەرما ئەبێ بەو هەردە و بەردەوە مەڕ بلەوەڕێنێ ئەو جۆرە وەرزشەش مەچەکی ئەستوور کردووە و دەفەی ناو شانی چاڵ کردووە ئەم کوڕە شوانە چی لێ هاتبوو:

تیری خوای عەشق هەتا شاپەڕ دڵی سمی بوو
کچی جوتیار لەبەر چاوی بت بوو پەری بوو

ئیتر ڕەهەندەی شاخ و داخ دۆزەخی بەبەردا هەڵگەڕان، کزەی ئێسک کونکەر لای ئەو بایی هەوا بوو چونکی تیری خوای عەشق دڵی سمی بوو! لەو لاشەوە کچە: ئەو نازدارەش بەشەو و ڕۆژ نەخشی خەیاڵی کوڕی شوان بوو باڵای بەرزی ناو شانی چاڵی کەواتە ئەگەر هات و بەپێچەوانەی تارای سورمەچنەکە لەژێر ئەو ئاڵووالآیەدا دڵێکی ناکامی بە زۆر ڕاکێشراو ببینین سەیر نییە کە ئەڵێ: ئاغای خاوەن هێز و شکۆ خاوەن سامداری لە کاتێکا درێژ ئەکا دەستی دڵداری بۆ گەردنی گوڵی کێوی لەجێ هەڵکەندراو نمی فرمێسک بەدی ئەکا لەسەر کلی چاو ئەم ڕاستییەش هەموو کەسێ لێی ڕوون بوو بەرد و داریش چون: هەتا ڕێگای دارستان و ناو ڕان و دێبەر بوو بەشانۆی سەر گروشتەی دڵدار و دولبەر هەرچی دار و دەوەنی ئەو مەڵبەنە هەیە هەمووی ئاگاداری ئەو عەشقە پاکە بوون بەڵام ئەنجام چۆن بوو؟ کارەسات چۆن گۆڕا، تا کوێ دڵداریەکە بڕی کرد؟ ئەبێ ئەو دڵە لە لێدان بوەستێ چونکە «تفاعلە اجتماعیە»کە (عاملە طبقیەکە) ئەوە هەڵئەگرێ. چۆن:

پەنجەی کینە لەسەر پیلکەی تفەنگ کەوتە کار
کۆستی دڵی بۆ ئێجگاری کەوت کچی جوتیار

شوانە کوژراو:



ئێستاکە ئەوا هەرچی بڵێی نیعمەت و نازە
هەمووی ئەدا بە یەک دڵۆپ فرمێسکی تازە
کە ئەنجامەکە دراماتیکە

***

## هەموو شتێ بەخوێ خوێش بەمانا[1]

ڕەنگە هەندێک نەزانن کە بۆچی سەردەمێک ڕێم دا بەچەند دۆست و برادەرێک کە هەندێ لە گۆرانییە کلاسیکی و نیشتمانییەکان تۆمار بکەن؟!

سەردەمێکی کورت لە ژیانمدا سەپێنرا بەسەرما کە بچمە قاوغێکی ئەوتۆوە کە لەم ڕێگایە بەولاوە (ڕێگای نووسین) و ڕێی بڵاوکردنەوەی چەن گۆرانییەک کە گیانی نەتەوە خۆشویستن ئەبزوێنن نەتوانم پەل بۆ هیچی تر بهاوێژم!! تۆمار کردنی هەندێ گۆرانی وەکو (ئەژدەهاک، دەروێش عەبدوڵڵا، نەورۆز، کوردستان، زیاتر مەبەستم لە هاوکاری کردن بوو لە بزووتنەوەی بۆ پێشەوەچوونی گەلی کورد بوو وەک لەوەی مەبەستێکی ترم هەبێ.

ئەتوانم پەنجە بکەم بەچاوی ئەو کەسەدا کە بڵێ (بەبەرامبەرێک) گۆرانییەکی تۆمار کردووە. تەنانەت ناردنی ئەو چەن گۆرانییە سادانە بۆ ئێستگەی کوردی بەغدا بێ ئاگاداری و پرس پێکردنم بووە.

من لێرەدا مەبەستم لەوە نییە کە پێم ناخۆش بێ گۆرانییەکانم بڵاوبێتەوە بەڵکو زۆر شانازی پێوە ئەکەم کە بگاتە هەموو کونجێکی کوردستانی خۆشەویست چونکی دەنگخۆشی شتێک نییە دروستم کردبێ بەڵکو سروشت پێی بەخشیوم. بەڵام لێدانی شریتە تۆمار کراوەکان بەو هەموو کەموکوڕیەوە، بەبێ مۆسیقا، پچڕپچڕ، تێکچوو لە ئەنجامی ئەم دەس و ئەو دەس و ئەم شریت بۆ ئەو شریت!! ئەڵێم بێجگە لەوە لێدانی لە هەندێ چایخانە و دوکاندا لە بەیانییەوە بۆ ئێوارە لە ئێوارەوە بۆ نیوە شەو لە تام چووەتە دەرێ. خۆم تا ئێستا چەن تکای تایبەتی یا ڕاسپاردەم کردۆتە سەر ئەو چەن چایخانە و داوام لێ کردوون کە سنوورێک بۆ لێدانی ئەو شریتانە دانێن. بەڵام بێ سوود بوو، وە لەبەر ئەوەی کە کەمەکێ لەباری کۆمەڵایەتی کوردەواریمان گەییوم کە تا تەنانەت هێندێ لە ڕۆشنبیرەکانیشمان هێشتا گۆرانی لەپاش ملە بە(نەنگ و خەوش) دائەنێن. ناچار بووم لە ڕێی ڕۆژنامەوە ئاگاداریان بکەم کە ئەو چایخانە و دوکانە

(١) ڕۆژنامەی ژین ساڵی ١٩٦١.

سنوورێک بۆ لێدانی ئەو شریتانە دانێن، ئەگینا ناچارم ئەکەن پەنابەرمە بەر یاسا بۆ وەستاندنی چونکی پێشینیان وتوویانە هەموو شتێ بەخوێ خوێش بەمانا.

١٩٦١

***

## یادی شەهیدەکانی ڕێگای ئازادی کوردستان

دیلان: ئەندامی یەکێتی لاوانی دیموکراتی عیراق

شەڕی جیهانی دووەم بڕایەوە بەبڕانەوەی ئەو شەڕەی کە گەلان فاشیزمی لەناو برد و نەتەوە ژێردەستەکان ئەو نەتەوانەی کە چاوی ئاواتیان بڕیبووە ئەنجامی بڕانەوەی شەڕ بەرامبەر بەئیمپریالیزم کەوتنەوە خۆ کۆکردنەوە و بەگژاچوونی بۆ بەدەستهێنانی سەربەخۆیی نیشتمانی و دەسەڵاتی نەتەوەیی پاش ئەوەی دەرکەوت کە پەیمان و گفتی ئیمپریالیزم تەفرە خواردن مانای مل ڕاکێشانە بۆ نەخشەی داگیرکەرانەی. لەبەر ئەوە لە هەموو لایەکی جیهانەوە بەتایبەتی لە ڕۆژهەڵات وە بەتایبەتی تر لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستا ڕێچکەیەک هەستا لەسەر پێی نەتەوەکان دەستی پێ کرد، (کە هەستانی نەتەوەی کورد یەکێ لە ئەڵقەکانی ئەو زنجیرەیە بوو).

نەتەوەی کوردی پارچە پارچەکراوی دەستی ئیمپریالیزم کۆماوەی باری گرانی هەژاری، زامدار چەوساندنەوەی نەتەوەیی تاساوی نەخۆشی و دەردەسەری بەم هەموو برینانەوە چاوەڕێی لێدانی زەنگی هەستان بوو یا وەستاوی تروسکەیەکی ئەو سەرکەوتنانە بوو کە گەلان هێنایان بەسەرۆکایەتی یەکێتی سۆڤیەتی مەزن بۆ ئەوەی شەوەزەنگی دیلیەتی لێ بگۆڕێ بەڕۆژێکی ڕووناک. ئەڵێین بۆ ئەم مەبەستە شێرانە هەستایە سەر پێ لە عیراقدا ڕووبەڕووی کۆنەپەرست و ئیمپریالیزم و شیری شۆڕشی لێ هەڵکێشا لە ساڵی ١٩٤٥دا ئەو شۆڕشەی کە هەوێنەکەی بارزانییە نەبەردەکان بوون و گڕەکەی زوو نیشتمانپەروەرە کوردەکانی گرتەوە. هەڵکردنی ئاڵای شۆڕش لەسەر چیا بەرزەکانی بارزان بەرامبەر بەدوژمنی دوو گەلەکەی عیراق کە کورد و عەرەبە وە پتەوبوونی ڕیزەکانی بەسەرباز و ڕۆشنبیر و ئەفسەرەکانی کورد مەترسییەکی گەورەی خستە دڵی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستەوە لە عیراق. بۆیە دڕندانە چەکی هەوایی ئیمپریالیزمی ئینگلیز و خۆفرۆشە کوردەکان و کۆنەپەرست کەوتنە هەڵپەی ئاگر پڕ کردن لەپێشەوە وە لەپاشا هێرشێکی نامەردانە بۆ سەر شۆڕشگێڕەکان وە ناچارکردنی هێزی بەربەرەکانی کشاندنەوە بۆ کوردستانی ئەودیو. لە کاتێکا لە ئەنجامی بڵاوبوونەوەی بیروباوەڕی نیشتمانی و دیموکراتی لە ئێران و بەیارمەتی یەکێتی سۆڤیەت کە دۆستی



هەرە گەورەی گەلانە، تەگبیری هەڵکردنی ئاڵای سەربەستی ئەکرا لەو پارچە بچکۆڵەیەی کوردستانا کە دەسەڵاتی کۆنەپەرستی شاهی تێدا نەمابوو. کشانەوەی شۆڕشگێڕەکان بۆ کوردستانی ئێران و دامەزراندنی (حکومەتی کوردستان)، زیاتر دڵە لەرزی بەئیمپریالیزم و کۆنەپەرست خست لە عیراقدا. بەتایبەتی لە کاتێکدا هێزی دیموکراتی پێشکەوتوو بەرەو پەرەسەندن ئەڕۆیشت و کەوتبووە شەڕەوە لەگەڵ داگیرکەر و کۆنەپەرستا و لایەنگیری ئەو بزووتنەوەیەی ئەگرت لە ئێران کە شۆڕشگێڕەکان هاوبەشی دامەزراندنی بوون.

لەبەر ئەوەی کە ئیمپریالیزم ئەم شێوە دەسەڵاتە نیشتمانیەی بەهەڕەشەیەک ئەزانی لە ئیستراتیژیەت و قازانجی داگیرکەرانەی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا کەوتە هەوڵی (پیلان) بۆ لەناو بردنی بەرهەمی خەباتی نەتەوەکەمان.

ئەوەبوو دڕندانە کۆنەپەرستی ئێران بەپشتگیری داگیرکەری ئەمریکا و ئینگلیز هێرشێکی جانەوەرانەیان هێنایە سەر کۆمارە ساواکەی مەهاباد و گوڵ بەخوێن ئاودراوی ئازادی گەلی کورد لە ئێران دووبارە خرایەوە ژێر چەکمەی کۆنەپەرستی شاهانە. وە شۆڕشگێڕە کوردە عیراقیەکان پاش کێشمە کێشمێکی زۆر بەسەرۆکایەتی تێکۆشەر مستەفا بارزانی وە لەدوای تێکۆشانێکی چەکدارانەی سەخت دڕیان بەلەشکری سێ دەوڵەتی کۆنەپەرست دا و خۆیان گەیانە خاکی یەکێتی سۆڤیەت وە ئەو دەوڵەتە مەزنە باوەش گەرمی پەناو دۆستایەتی بۆکردنەوە. حکومەتی کۆنەپەرستی ئەوسای عیراقی تۆقیبوو لە نیشتمانپەروەری زراوی چوو لەبیری دیموکراتی و ئاشتی خوازێتی زارەترەک لە پتەوبوونی برایەتی کورد و عەرەب بۆ ترساندنی خەڵکی عیراق بۆ هەڕەشە لە بزووتنەوەی نیشتمانی بۆ شکاندنی تینوبەتی ئیمپریالیزمی خوێنخۆر لە ١٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٧دا چوار ئەفسەری تێکۆشەری کوردی کرد بەدارا. خنکاندنی ئەفسەران محمد محمود، خیرالله عبدالکریم، مصطفى خوشناو، عزەت عبدالعزیز. ئەگەر بۆ کۆنەپەرستی ئەوسای عیراق و ئیمپریالیزم بۆ پشوویەک دەگەڕێ. بۆ بزووتنەوەی نیشتمانی گەلەکەمان بەبەردێکی ڕێبازی خەباتی شۆڕشگێڕانە ئەژمێرێ ئەگەر بۆ دوژمن بەزەبر و دەس وەشاندن دابنرێ بۆ ئێمە مەشخەڵێکی ڕێی سەرفرازی و ڕزگارییە ئەگەر دوژمن لە خنکاندنی ئەو ئەفسەرانە و خەباتکەرانی تری عیراق ویستبێتی کڵپەی شۆڕش بکوژێنێتەوە خەیاڵی خاو و لێکدانەوەی بێ سوود بووە. چونکە لەبەرەبەیانی ڕۆژی چواردەی گەلاوێژی نەمر تۆڵەی بەر و دوای لە دوژمنانی گەل کردەوە. ئێمە کە لاوانی دیموکراتی عیراقین لە کاتێکا کە یادی سیانزەهەمینی

قوربانیەکانمان ئەکەینەوە ئەبێ چاومان لەوەبێ کە ڕێی سەرفرازی لە دەسەڵاتی ئیمپریالیزم ڕێگای خەباتی وەک یەکی کورد و عەرەب و هەموو کەمایەتیە نەتەوەکانی تری عیراق و بەهێزکردنی برایەتیان بوو. ئێمەش خوێنی شەهیدەکانمان بانگمان ئەکات بۆ ئاگاداری بۆ یەکگرتن بۆ پاراستنی کۆمارەکەمان بۆ تێکۆشان بۆ فراوان کردنی سەربەستی دیموکراتی بۆ ئیفلیج کردنی پەراگەندەی هێزە کۆنەپەرستەکان وە دەرەبەگەکان. ڕێگەی سڵەمینەوە لە جوڵەی دوژمنەکانی ئاشتی و دیموکراتی.

١٩٦٠/٦/٢٣

***

# نەتەوەی کورد و دوژمنانی(١)

بەبۆنەی نووسینی چەن ڕۆژنامەیەک دەربارەی نەتەوەی کورد، بەشێوەیەکی گشتی وترا: ئیمپریالیزم دوژمنی یەکەمی نەتەوەی کورد و ئاواتەکانیەتی، وردبوونەوە لە مێژووی شۆڕشەکانی، شکست هێنانی شۆڕشەکانی کۆسپ خستنە بەر داواکردنەکانی لە شەست ساڵی ڕابردووەوە تا ئیمڕۆ، کوشتنی کوڕەکانی چ بەپەت و چ بەگوللە هەر لە دکتۆر فوئاد و شێخ سەعیدەوە تا قازی و قودسی و هاوڕێکانی، دەربەدەری، دەردی سەری، چەوساندنەوە، ئەمەو ئەوەو هەموو ئەو دەردانەی کە نەتەوەی کورد تووشی بووە، وتراو ئەوترێ کە (أسی البلاد)ی نەتەوەکەمان ئیمپریالیزم و پیلانەکانی بووە و تا ئیمڕۆش بەردەوامە!

بەڵام کە وترا (شێرپەنجەی) نەتەوەی کورد ئیمپریالیزمە بەشێوەیەکی گشتی مانای ئەوە نییە بەشێوەیەکی تایبەتی لەملاو لەولاوە دوژمنی تری نییە، ئەگەر ئیمپریالیزم بریتی بێ لە دڕندەیەک بێ گومان نینۆک و کەڵبەکانی بریتییە لە (کلک و پیاوەکانی) لە دەوروبەری ڕابردوودا لە کاتێکا لە بیرمانە کە چوار ئەفسەرە تێکۆشەرەکە خنکێنران نینۆکەکانی ئیمپریالیزم ئەو نینۆکانەی کە چەقیە جگەری ئەو چوار ئەفسەرە بریتی بوو لە (عبدالاله، نوری سعید، صالح جبر) لە کاتێکا لە ڕۆژنامەکاندا قەدەغەکرابوو ناوی کورد یا کوردستان هێنان. نینۆکی ئیمپریالیزم بریتی بوو لە (عمر علی) و چەن کلکێکی تر. شێوە و وێنە زۆرە بۆ بەڕاست گێڕانی واتەکەمان، بەیەکێکیان وت (زیرەکی) وتی (ئاخ خوێندەوار بوومایە) وتیان بۆچی؟ وتی هەورم نەئەهێشت کە بارانی لێ ئەبارێ کە زەوی و کانیاو ئەژیەنێتەوە کە مایەی بزووتنەوەی ژیانە کە ئەوەی

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١٥٥٦) ١٩٦٠/٨/٢٩.



مرۆڤی پێ ئەژی بەکورتی هەور ئەم وەرز بۆ ئەو وەرز زستان بۆ بەهار بۆ هاوین... هتد. ئەم کێشیە ئەگێڕێ و ئاورتفاق بۆ ئەم خەڵکە دروست ئەکا (زیرەکەکەمان نەی ئەهێشت) ئێستێ هیچ نەبوایە بڵێ (کوللە و زەردەواڵە و مێشوولەم نەئەهێشت) کە مایەی زەرەر و جۆرە حەشەراتێکن پێویست بەلەناو بردنیانە ئیمڕۆش کە کۆمارەکەمان تازە خەریکە چاوی خۆ داکوتان هەڵئەهێنێ تازە خەریکە بەردی بناغەی سەربەخۆیی تەواو و ڕزگار بوون لە فێڵەکانی ئیمپریالیزم دائەنێ و خەریکە ئاڵتونە ڕەشەکەمان لە کۆمپانیا نەوتەکان ئەسێنێتەوە ئەفەرموون کورد نییە، کورد عەرەبە لەو دیویشەوە ئەڵێن کورد فارسە لەولاشەوە ئەڵێن کورد تورکی شاخە لەم کاتەدا کە مەسەلەی داڕشتنی برایەتی کورد و عەرەب و بەهێز کردنی برایەتیان شیعاری هەرە بەرزی هەموو نیشتمانپەروەرانی عیراقە، ئا لەم کاتەدا (زیرەک: ئەڵێ کوردم نەئەهێشت). کورد مەهێڵە کە تای تەرازووی عیراقی پێ هاتۆتەوە کە مادە سێی دەستوری موەقەت ئەڵێ شەریکە لە نیشتمانا.

بیروبڕوا جۆرجۆرە هەر لە نیشتمانپەروەرەوە تا دیموکراتی تا سۆشیالیزمی... هتد وە لە زۆر وڵاتا تا لە وڵاتە سەرمایەدارەکاندا ڕێزی ئەگیرێ وە جۆرەها پارتی بۆ دروست بوو بەڵام ئەو بیروبڕوایەی کە نەتەوەکان تا حکومەتەکانیش لە لەعنەتیان کرد بیروبڕوای فاشیزمە... هیتلەر کە ئاگری بەر ئەدایە غەیری نەتەوەی ئەڵەمان گرتەوە و ئا بەم دەردەی برد. کە بردی بیروبڕوای فاشستی لە دەوری مانگی دەستکرد و هەوڵدان بۆ گەیشتنە ئاسمانی دوور و وەکو لە دایک بوویەکی بێ سی وەهایە بەکەوتنە خوارەوەی ئەخنکێت، دوا وشەمان بۆ ئەوانەی کە ئەیانەوێ لەسەر حسابی نەتەوەی کورد هەور نەیەڵن تۆزێ گوێ شل کەن بۆ دەنگوباسی ئەفەریقای خواروو ئەوانەی کە ڕاو ئەکران و ئەبران بۆ ئەمریکا و ئەوروپا بۆ گسک دان و ئارەق ڕشتن، وا یەک لەدوای یەک سەربەخۆیی وەرئەگرن و ئەبنە خاوەنی بەروبوومی وڵاتی خۆیان گوێ شلکەن برایەتی کورد و عەرەب بەنووسینی ساختە تێک ناچێت.

١٩٦٠

***

## مەولەوی[1]

مەولەوی "مەعدووم" بلیمەتێکی بیرکەرەوەیە. مەولەوی بلیمەتێکی بیرکەرەوەیە پێش ئەوەی شاعیرێکی بلّندبێ. شۆڕشگێڕێکە لە شیعری کوردیا لە کاتێکا ئەو لە سەردەمێکا بووە کە ئەدەبی (کورد)، ئەدەبی فارسی کاری تێ کردبوو.

نەتەوەی کورد خۆی بەبەختیار و شانازی کار دائەنێ چونکە خاوەنی ئەو (جمجمة)یەیە کە تا ئێستاش لە (تاوگۆزیدا) لە کاتێکا شەو باڵی ڕەش ئەکێشێ بەسەر لووتکە بلّندەکانی (جوانرۆ)ی کوردستاندا درەوشەیەک بەرەو ئاسمانی پڕ لە جریوەی ئەستێرە ئەکشێ، خۆی بەبەختیار ئەزانێ کە خاوەن ئەم مێشکە بەرز و تیژ بینەی مەولەوییە. لێرەدا ئەگەر بێنین لەسەر مەولەوی بنووسین یانی کتێبێکی لەسەر بنووسین و ناوی بنێین (عرض و تحلیل و نقد)، لە شیعرەکانی مەولەوی پێویستمان بەچەند (مجلد)ێک هەیە نەک بەدوو سێ لاپەڕە ڕەش کردنەوە.

ئێستە بەکورتی باس لە سیفەتەکانی مەولەوی ئەکەین لە شیعرا:

یەکەم: مەولەوی بلیمەتێکی بیرکەرەوەیە پێش ئەوەی شاعیرێکی بلّندبێ.

چین کەفتەن وەروی پێشانەش چون سیم
چون زنجیرەی ئاو وەشنەی نەسیم[2]

هەچ شاعیرێ یا هەچ ئەدیبێ بێت باس لە ڕووی خۆشەویستەکەی بکات لە کاتێکا ڕووی خۆشەویستەکەی بەرەو لۆچ تێ کەوتن و پیر بوون بڕوا ئەگەر ئەو پەری تەعبیر بکات لەم مەبەستە تەنها ئەوەی لە شیعری کوردیا دیومانە لە (وصف) یا (ئەدا)یەکی ڕووت زیاتر نەبووە و نییە، یانی لەوە زیاتر نەبووە کە ئەگەر زۆر قووڵ بڕوات خۆی ببەستێ بە(جناس) و (توریە) و (مرادفاتی) قسەوە، بەڵام مەولەوی بەبازێکی بیرکردنەوە خۆی گەیاندۆتە لووتکەی لقەکانی (تصویر)، خۆی گەیاندۆتە ئەوپەڕی چاو لەشت بڕین، جوانی سروشتی تێکەڵ بەشیعری کردووە، نەک تەنها جوانی سروشت، هاتووە جوانییەکانی سروشتی تشبیە کردووە بەشێوەی جوانی خۆشەویستەکەی. جا با بێینە سەر (شەرح)ی کە بۆ میسال هێنانەوەمانە.

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١٣٣٤) ١٩٥٧/٢/٢٨ بەشی یەکەم. ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١٣٣٥) ١٩٥٧/٣/٧ بەشی دووەم.

(٢) دیلان، مەولەوی و شیعری مەولەوی زۆر خۆش ئەویست، هەر بەدەقە هەورامێکە زۆر شیعری مەولەوی لەبەربوو، دووجار لە بارەی مەولەوییەوە نووسیویە ئەم نووسینە لە شوباتی ١٩٥٧دا نوسیوویە، بۆ دووەم جار لە ساڵی ١٩٨٥ لە ژمارە (١١٥)ی گۆڤاری (بەیان)دا.



لە کاتێکا خۆشەویستەکەی سا یا لە پیریا یا لە ئەنجامی خەفەت و دەردەسەری و ناهەمواریەوە لۆچ کەوتۆتە سەر ڕووی گۆنا سوورەکانی وەک گەڵای زەردی پایز گەردی گێژەڵوکەی ژاکاندنی نیشتۆتە سەر، چی پێ بڵێ داخەکەم گۆنات لۆچی تێکەوت وەکو لۆچەکانی دەمەووچاوم یا وەکو لۆچ و درزەکانی دڵم! نە ء وای نەوتووە ئەڵێ: ئەو لۆچانەی کە کەوتۆتە سەر ئەو ڕووەی کە وەکو «سیم» سپی و بێ گرێیە لە ئاوێکی مەنگ ئەچێ کە بەشنەی شەماڵ زنجیرەی تێ بکەوێ، لێرەدا ئەبێ ئاوێک بهێنرێتە پێش چاومان کە شەماڵ شەپۆلی نەرمی پێ ئەدات.

یا ئەڵێ:

سەر نەتەرەی غەم خول ئاوردەوە
تای گرژ مەینەت دوباد کردەوە

مەولەوی بەپێچەوانەی شاعیرەکانی ئەو دەورە کە ئەگەر ڕەشبینی لە شیعرەکانیا بووبێ تەنها لەبەر (هجران، فراق، بێ وەفایی) خۆشەویستەکانیان بووە. کەچی ئەم وا دەر ئەکەوێ (فطرە) شیعرەکانی بەرگێکی بۆ کرووزاوی کردووە بەبەرا. ئەشێ لە گوزەرانی کۆمەڵایەتی ئەوسا زۆر بێزار بووبێ لەو کۆمەڵەی کە ئەوی تێدا ژیاوە نارەزا و لووت خوار بووبێ، بۆیە ئەڵێ:

سەرەنەیش (غەم) خواردەوە و تای گرژی مەینەتی دووباد کردەوە با بێین لەم تەعبیرە بدوێین کە یەک لەیەک زیاتر بەناخی وردبوونەوەدا ئەچنە خوارێ. مرۆڤ کە پەست و خەفەتبار بوو ئەم شیعرەی لا خۆشە:

غەم ئەڵێی قەرزی بەمن داوە سەری وەعدەیەتی
ڕوو لەهەر کووچە دەکەم دەست و گریانی منە

مەولەوی وا ناڵێ ئەڵێ: خۆم غەم چۆتە پێستمەوە و ناچێتە دەرێ. کەچی سەرەنەیش غەم بایەکی تر ئەخواتەوە یا (تاڵی) مەینەتی و دەردی سەری و کە خۆی گرژە دوبادی ئەکات، ئەیکات بە دوو تاو و پێچی پێ ئەدات کە خاو بوون و پچڕاندنی زۆر زەحمەتتر ئەبێ، جا با وردبینەوە لە وشەی، سەنەتەرە، تاو، پێچ، دوباد، گرژ، ئەو خەفەت و مەینەتانە چی لێ دێت پاش ئەمانە: یا ئەڵێ:

هوریزەن صبحەن دڵ تازە خاوەن
شنەی پەی کاوەن گوشەی سەراوەن
جەی گوشتە خاستر نیەت مەسکەنێ
ساقی گیان ئامان خومار شکەنێ

وتمان مەولەوی بلیمەتێکی بیرکەرەوەیە پێش ئەوەی شاعیرێکی بلّند بێ، چۆن؟ شەوێ بەکزەی ساردی کوێستانی کوردستان و هەورە تریشقە و چەخماخەی بەهار و لە شەوا لەپڕ شەبەق و گزنگێکی ئاڵتونی ئەکەوێتە سەر چرۆ و گۆپکەکانی درەختە ژیاوەکان وەنمی ئاورنگ ئەنیشێتە سەر چیمەن و گوڵە تازەکراوەکان، لەم کاتەدا ڕاپەڕین لە خەو بۆ ژیان و کار و بۆ (تمتع) کردن بەدیمەنە جوانەکانی کوردستان، چاو پێ سورمە ڕێژکردنی، هەر بەبیری مەولەویدا هاتووە کە ئەڵێ: هەڵسە لە خەو بەیانە و دڵ تازە خاوە، شنەی شەماڵی (کاوەن) زەردەکان وا لە گوێ کانیەکی ژیاوە دانیشتووین هەڵسە لەم گۆشەیە بەولاوە چاکترمان دەست ناکەوێ، ساقی گیان دەخیلتم خومار شکێنێ، لێرەدا ساقی مەبەستی مەولەوی هەر چۆنێ بووبێ بەرامبەری ئێمە ئەتوانین بەم جۆرە لێی بدوێین: شنەی شەماڵی کاوەمان وە گزنگی هەتاو بەهەموو مانایەک خۆش و جوڵەی ئەم جیهانەمان دێنێتە پێش چاو کە لەپاش بەستەڵەکو زەمهەریری زستان ئەکەوێتە بەهار ئەو دەمەی کە مەولەوی بەبیریا هاتووە کەوا بوو ساقی گیان ئامان خومار شکێنی. یا پیاڵەیەکی تر بۆ ئەوەی بگەمەوە دۆخی مەستیەکەی شەوم با پیاڵەیەک بەسەربەستی و مەستی لە خەفەت و دەردە سەریا با ئیتر ڕێی ژیان بگرم و لەم بەهارە جوانەی وڵاتەکەم خۆم بێ بەش نەکەم.

دووەم: مەولەوی شۆڕشگێڕێکە لە ڕیزەکانی قافیەی شیعری کوردیا لە کاتێکا ئەدەبی کورد ئەدەبی فارسی کاری تێ کردبوو، چۆن لە کاتێکا کۆڕەکانی ئەدەب لە سلێمانی، سنە، سابڵاخ، هەولێر، وان، دیاربەکر و هەموو شوێنێکی تری کوردستان شیعر و نووسینی فارسی زاڵ بووبوو بەسەریا و تام و بۆن و ڕەنگی شیعر بەسترابوو بەشێوەی شیعرەکانی سەعدی و حافز و کلیم چەن شاعیرێکی ناسراوی تری فارسەوە شاعیرەکانی کورد لە (غەزەل و روباعیات و فەردیاتا) تینیان لەوان وەردەگرت و شانازیان پێوە ئەکرد ئەگەر شاعیرێکی کورد چە بەکوردی وەچە بەفارسی شیعر بڵێ کە لە شیعری شاعیرە فارسەکان بچێ لە تام و بۆن و ڕەنگا، ئا لەم کاتەدا مەولەوی ئاڵای شۆڕشی شێواندنی شێوەکانی (عروض) هەڵکرد و ئەڵێ:

مانام مەکەرۆ گرانە دەردم
ارشێویا بوو قافیەی فەردم

قافیەی فەردیش چۆن بشێوێ باشە:

فەریا جە سەختی زەوی چارەی من
هەر سەوزەی مراد من نادیارەن



داد جە هەوای شووم بەدستارەی من
هەر ئەو گولالەی من تا پیوارەن

مانای لۆمەم مەکەن ئەگەر قافیەی شیعرەکانم بشێوێ چونکی دەردم زۆر گرانە، شێواندنی ئا بەو شێوەیە بوو کە لەسەرەوە نووسراوە. هاوار لە شوومی زەوی چارەی من لە ڕەقی و سەختی وشکی بێ ئاوی زەوی بەخت و چارەی من، سەوزەی بەختی ئەوان باش و بەگەشەیە تەنها زەوی بەختی من بێ پیت و بێ گوڵاڵە و شەفافە لەبەر ئەوە سەوزەی ئاوات و ئامانجی من نادیارە و گەشە ناکات، داد لە هەوای نەگبەت و گوزەرانی من، هەر ئەو گوڵاڵەی من نا پیوارە، بەکرچ و کاڵی ئەمێنێتەوە پێ ناگات، یان دیار و سەوز نابێ. بەڵێ لە کاتێکا خوێندەواری لە کوردستانا بریتی بوو لە (حوجرە) و بەفەقێ دەرچوون و خوێندەوارەکان نەک تەنها بەڕۆشنبیری فارسی مێشکیان ئاو درابوو بەڵکو ڕێی لاسایی کردنەوەی ئەوانیان گرتبووە بەر بەشاعیر و ئەدیبەوە، ئا لەم کاتەدا مەولەوی ئەم شۆڕشەی کردووە.

سێیەم: وتمان مەولەوی بلمەتێکی بیرکەرەوەیە پێش ئەوەی شاعیرێکی بلّند بێ ئێستا زیاتر لەوەش ئەڵێین، (زانیار)ێکی بێ هاوتاش بووە. بۆچی؟ وتمان لە کاتێکا ئەدەبی کورد ئەدەبی فارسی کاری تێ کردبوو مەولەوی شۆڕشێکی کرد لە قافیەی شیعری کوردیا ، هەر لە هەمان کاتا ڕێی ئەدەبی (ڕۆمانتیکی- الأبداعی) گرتە بەر بێ ئەوەی ئاگای لە هێرشی ڕۆمانتیکی بێ لە ڕۆژئاوادا ئەو هێرشەی کە لە بەریتانیاوە دەستی پێ کرد و گەیشتە فەرەنسا و ئەڵمانیا و چەن جێگایەکی تری ئەوروپا هونەر تەنها لێرەدا نییە کە ڕێی ڕۆمانتیکی گرتبێتە بەر لە شیعرا، ئەو لە کاتێکا ئەو ڕێیەی گرتەبەر ئاگای لە شیعری ڕۆژئاوایی نەبووە، نەی دیوە، نەی بیستووە کەچی بەبازێکی (ابداع) تەنها ئەو ڕێیەی گرتووە و بەس بەڵکە لە هەندێ لە شاعیرە ڕۆژئاواییەکان وردتر بۆی ڕۆییوە، ئەڵێ:

لە وەلوەی دڵ، سا دەروێشی جۆشێ
بەو سەدای ڕیشەی دڵ ئاشناوە
یا جۆشی سەمتور موتریب خرۆشێ
چنی ئەی دوفرد حەسرەت ماناوە

لە هاوار و ناڵە و (حاڵ لێ هاتنی دڵم) ئەی دەروێش جۆش بسەنە بەو دەنگەی بەرەگ و ڕیشەی دڵ ئاشنایە، بانی دڵی هەمیشە کورەی وەلوەلە و هاوار و ناڵینە لەبەر ئەوە دەنگەکە بەدڵ ئاشنایە و ڕاهاتووە یا لەگەڵ دەنگێکا ئاشنا بێ بەدڵ، یاخود

سەمتوو جۆش بسەنە و گۆرانیبێژ خرۆش، چریکەیەک، ئاوازێکی بەرز و بەسۆز بەم دوو شیعرە پڕ لە حەسرەت مانایەوە، بۆم بخوێنەرەوە.

با ســـەوز بێ تـوم ئـارەزووەکــەی دڵ
ئەچم دەخـــیلم، شــەوێ، شــەونمی
بەشکم سەر دەرخا ئەو نازک ئەو گوڵ
ئاهە نەسـیــمی سـەحـەرگـا دەمی

با سەوز بێ و بڕوێ تۆوی ئارەزووی دڵ بەچی؟ ئەی چاو دەخیلم بەشەو شەونمی، یانی بەشەونمی فرمێسکم بەدڵۆپی گریانی شەوم با تۆوی ئارەزووی دڵ سەوز بێ، چونکی تۆوی ئارەزووی دڵم بەفرمێسک نەبێ ناڕوێ، بەشکم سەر دەرخا پاش بارینی فرمێسکەکانم بەسەریا بەبای نەسیمی شەبەق دەمی نەختێ، هەناسەیە، ئەبێ بچینەوە بۆ دڵ، دڵ هی خۆی نییە هی خۆشەویستەکەیەتی. خۆشەویستیش دڵڕەق و بێ بەزەییە تا کڕوزاندنەوە و کڕنوشت لێ نەبینێ تا فرمێسک و ناڵینت لێ نەبینێ ئاوڕێکیت لێ ناداتەوە کە ئەو ئاوڕەش بریتییە لە سەوز بوون لە شەبەقایایە هەوار سەحەر وەکو گوڵ چۆن ملی بەرز ئەکاتەوە و ئەکرێتەوە، یاخو بەمانایەکی تر هیچ شتێ بەبێ دەردی سەری نایەتە بەرهەم، دەستی ماندوو لەسەر سکی تێر.

یاخود بەئازار نەبێ خۆشیت دەست ناکەوێ، کەواتە با سەوز بێ تۆوی ئارەزووەکەی دڵ بەنمی فرمێسکم چونکی بێ فرمێسک ناڕوێ، بەشکم سەر دەرخا ئەو ناسکەی ئەو گوڵ بەبای هەناسەی ئاهو ئاخم چونکە ئەوەی پێ خۆشە.

١٩٥٧

***

## ئەحمەدی خانی[١]

-١-

ئەحمەدی خانی باوکی (ملحمة)ی ئەدەبی کورد، خاوەنی قوتابخانەی نەتەوەپەرستی لە شیعرا.

نەتەوەی کورد ڕۆژێک دێت کە پەیکەر بۆ پیاوە نەماوەکانی دروست بکات کە بێ گومان لە مەولەوی و ئەحمەدی خانییەوە دەست پێ ئەکات.

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١٣٣٦) ١٤/٣/١٩٥٧.



لە نووسینەکانی لەمەوبەردا (لە ڕێی بووژاندنەوەی ئەدەبی کوردا) (مەولەوی بلیمەتێکی بیرکەرەوەیە)، لە بووژاندنەوەی ئەدەبی کورد و گونجاندنی لەگەڵ ئەم قۆناغەی کە هێشتا کوردەواری پێدا ئەڕوات دواین. ئێستە دێینە سەر باسی یەکێ لە شانازی پێوەکارەکانی نەتەوەی کورد کە (ئەحمەدی خانی)یە بۆ لێدوان لە ئەحمەدی خانی وەک شاعیرێک و شاعیرێکی بڵند و چیرۆکنووس بەشیعر، بەکورتی پێویستە لە دوو لقی بناغەیی بکۆڵینەوە:

یەکەم: ئەحمەدی خانی باوکی (ملحمة)یە لە ئەدەبی کوردا، چۆن؟

گەلە خاوەن ڕابوردووەکان، خاوەن مێژووە دوور و ڕووناکەکان کە بێینە سەر باسی ڕابوردوویان، شانازی بەڕابوردوویانەوە بکەن، لەپێشا شانازی بەڕووداوە نیشتمانەکانیانەوە ئەکەن ئینجا ڕووداوە کۆمەڵایەتیەکانیان. بەتایبەتی چیرۆکێ کە دەماودەم ڕۆیشتبێ و دڵداریەکی خاوێن نیشان بدات، وەکو (ڕۆمیۆ و جۆلێت)، لەناو گەلی ئیتالیادا و (قیس و لیلی) لەناو نەتەوەی عەرەبدا وە لە هەموو چیرۆکێ بەسۆزتر چیرۆکی (مەم و زین)ە لەناو کوردەواریدا. مەم و زین، چیرۆکێکی دڵداری و پڕ لە پاڵەوانی و پەیمان پەرستی و برادەر نەرەنجاندن و بەهەموو شێوەیەک بەناسۆرترین درامایە لە چیرۆکە دراماتیکیەکانی کوردەواری کە هەرچی چۆنێک بیسترابێ تا ئێستا ئەحمەدی خانی بەرگێکی وای کردووە بەبەردا و خستوویەتییە قالبێکی واوە کە بەڕاستی هونەری شیعر و وردبینی هەر ئەوەندە ئەتوانرێ بهاوێژرێتە نەخشەکێشانی نووسینەوە. لەپێشا دەست پێکردنی چیرۆکی مەم و زین بەستایشی خودا دەست پێ ئەکات و دوای ئەوە دێتە سەر گوزەرانی کوردەواری ئەوسا و ئەڵێ:

گـەر دی بـو هەبوا مـە سـەر فـرازەک
صـاحب کـەرەمـەک سـوخـەن نوازەک
نەقـــدی دەبوو بەسکە مـــسکوک
نەدەمـا و هەبێ ڕەواج و مـعـشــوق

یانی ئەگەر سەرفرازکەرێک لەناو کوردا هەڵبکەوتایە، خاوەن کەرەم و بیرکەرەوە و قسەزان بوایە پارەمان بە سکە لێ ئەدا و گومان و بێ ڕەوا چیمان لەناوا نەئەما و وە ئەبووینە خاوەنی خێر و بێری خۆمان. لەپاشا دێتە سەر ئەوانەی کە کوردستانیان داگیر کردبوو ئەڵێ:

غـــالب نەدەبوو لەســـەرمـــە ئەڤ ڕوم
نەدیوینە خـــــراپەی دوســـــتی بووم

یانی، ڕۆم بەسەر ئێمە زاڵ نەدەبوو وڵاتیشمان نەدەبووە کەلاوە و جێی کوننەپەپو. لەپاشا دێتە سەر باسی سروشتی نەتەوەی کورد و ئەڵێ:

جوامێری و همت و سخاوەت
مێرینی و غیرەت و جلادەت
ئەو خەتمە ژ بۆ قەبیلی ئەکراد
دان دانە بەشیر و همت و داد

یانی، جوامێری و پاڵەوانی و بەرچاو فراوانی سەربەرزی و غیرەت و سەخاوەت هەرهی کوردە و بەهی ئەوان دەناسرێ شێریش ئازایی و دادی لەوانەوە وەرگرتووە.
لێرەدا لە لێ وردبوونەوە، ئەم شیعرە ڕێکوپێک و ورد و پڕ لە گیانی نەتەوەپەرستی و (ملحمەی مەم و زین) گیانی ئاڕاستە کردنی ئەدەبی کوردمان نیشان ئەدات. لە شیعرەکانی ئەحمەدی خانی دا لە کاتێکا ئەودەمەی ئەو تیایدا ژیاوە ئەوروپای ڕۆژئاوا تازە خەریکی ڕووخاندنی قەڵاکانی دەرەبەگ بوون و خەریکی دروستکردنی ڕژێمی سەرمایەداری بوون کە (نەتەوە)ی لەژێر سایەدا دروست بووە وە پاش دروستبوونی نەتەوەکانی ئەدەبی ئاڕاستەکردنی شاعیرەکانی نەتەوە ژێر دەستەکان کەوتە مەیدانەوە کەچی ئەحمەدی خانی لە چیرۆکێکی دڵداری قوتابخانەیەکی دروستکردووە.
هونەری دارشتنی چیرۆکەکە لەو قاڵبەدا کە باسمان کرد لەو ڕەنگەدا کەوتمان و لەو بۆنەدا کە تا دێرزەمان بوونی پەخشانە تەنها مەگەر هەر ئەحمەدی خانی توانیبێتی بیرازێنێتەوە.

١٩٥٧

-٢-(١)

# ئەحمەدی خانی هونەرمەندێکی باڵایە

## هونەر

هونەر لە شیعرەکانی ئەحمەدی خانیا بەتایبەتی لە «ملحمە»ی مەم و زینا تەنها ئەوە نییە ئەو چیرۆکەی خستۆتە قاڵبێکەوە کە گیانی نەتەوەپەرستی و گیانی «خۆ» بەرزکردنەوە نیشان بدات. نەء، تەنها ئەمانە نین، ئەگەر ورد سەرنج بدەینە بەندەکانی «ملحمە» کە جارێ جگە لەوەی ڕێچکەی بیرکردنەوەی (التسلسل الفكري) لە

(١) ژین ژمارە (١٣٣٩) ١٩٥٧/٤/٤.



ئەوپەڕی ڕێکوپێکیدایە جگە لەوەش هەر (بەند)ە ئەتوانین وەکو پەردەیەکی فلیمی لە قەڵەم بدەین، یانی ئەگەر دەرهێنەرێک ببوایە و بمان ویستایە ئەم چیرۆکە بکەین بەفلیمێکی سینەما، دەرهێنەر لەو بڕوایەدام هیلاکیەکی ئەوتۆی پێوە نەکێشاوە کە شایانی باسکردن بێ، چونکی وەکو وتمان ڕێچکەی بیرکردنەوەی ئەوەندە جووتە لەگەڵ یەکدا پێویست بەمامۆستایی بەکارهێنان ناکات ئەگەر بتەوێت فلیمێکی لێ دروست بکەیت. با بێین بۆ ڕاستی واتەمان بەندی (مەم و مۆم) وەرگرین و بزانین هونەر گەیشتۆتە چە ڕادەیەک لەم شیعرانەدا:

مەم شمع دکر ژ بو خو دەمساز
کەی هەمسەر و هەمنشین و هەمڕاز
هر چەندە بسوهتنی وەکی من
ئەمانە بەگوهتنی وەکی من
گەر شوبهەتی من تەژی بگوهتا
دی من بەخو دل تەوی نسوهتا

یانی: ئەی مۆم باشتر لە هەموو شت ئەوەیە تۆ بکەم بەهاونشین و هاودەم و هاوشەو بەسەر بردن و هاوباسم، چونکی لەتۆ بەولاوە هیچ شتێ لێم نزیک ناکەوێتەوە.
تۆش هەرچەندە بەسووتان وەکو منی وەکو من ئەسووتێیت بەڵام من لەتۆ زیاتر ئەسووتێم تۆ تەنها هەر بەبێ دەنگ ئەسووتێیت، من ئەسووتێم و هاوار وناڵینیش ئەکەم. ئەشتوانم شتی تر بەهاوار و ناڵینەوە بۆ خۆم ڕابکێشم، لەبەر ئەوە ئەڵێم ئەگەر تۆش وەکو من بهاتیتایە وتن من ئیتر دڵم بەخۆم نەئەسووتا و باش دەرد و دوی خۆمم بۆ هەڵ ئەڕشتی و لەیەک ئەگەیشتین. لە کاتێکا مەم گڕی ئازاری بەدەست دڵە تووش بووەکەیەوە گەیشتۆتە ئەوپەڕی بلێسەی ئاسۆی ئاواتی بەیەک گەیشتنی هەور و تەمی بەیەک نەگەیشتن لێڵی کردووە. باخچەی ئەو هیوا گەشی و جریوەدارەی کە جاران هەیبوو بەرەو سیس و ژاکاوی ئەڕوات لێوی ناسۆری گەردی دەردی سەری گرتووی وا بەتەمابوو بنێتە سەر لێوی -زین- کە وەک چرۆی ئەرخەوان لە بەیانا لەپڕ تووشی گەرداوی داو بۆ دانان و لەناو بردن و ڕەنجاندن دێ. ڕۆژ بەڕۆژ هیوا کۆرپەکەی بەدەست دەردی ناکامیەوە لاواز و زەرد و بێ هێز ئەبێ ئا بەم گرەوە ڕوو ئەکاتە مۆم و ئەو (محاوەرە)یە دەکات لەپاشا ئەڵێ:

دەردی من و تە ژێک بفەرقە
ئەو فەرقە ژ غرب تا بشەرقە

مـــەشـــرق تەڤی ئاگـــری قـــەط هر
مـــەغـــرب ئەز و باطنی مـــە ئاگـــر
دائم و شـــرت مـــەرشـــتـــەی جـــان
تەناشـــــرتن بفـــــریری ازمـــــان

مـانای: دەردی من و تۆ لەیەک دوورن، ئەو دوورییـــەش لە ڕۆژئاوا تا ڕۆژهەڵاتە، ئەوەندە دوورن لەیەک تۆ ڕۆژهەڵاتی و گزنگ و ئاسۆ و شەبەقت دیارە و هەموو کون و قوژبنێ ڕووناک ئەکاتەوە و هەموو گیانلەبەرێک هەست بەگڕ و ڕووناکیت ئەکات و هەموو خاوەن چاوێ ئەتبینێ و مایەی جست و جربانی بەڵام من، منی دەردەدار، منی بەئازار منی بەهاوار، منی نادیار ڕۆژئاوام، ڕۆژئاوام و گڕەکەم وا لەناو گیانمادا لە دەروونما، ئنجـا با سـەرنج بدەینە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا ڕۆژهەڵات ڕووناکی ئاشکرایە. «ڕۆژئاوا» سەرنج بدەینە ڕۆژ لە کاتی ئاوا بوونا گڕەکەی لەناو گیانیایەتی.

لە پاشا ئەڵێ:

ئیڤار و سەحەر بر ڕوژ ئەگەر شەڤ
ئەز هەر و سوژم دەسا لەر هەڤ
گەه، گاه، ژ دست دلی بریندار
ناچار دبو ژ جان بیزار

یانی ئێـوارە و بەیانی ڕۆژ و شـەو من هەر لە سـووتانم هەندێ جـار لە دەست دڵە بریندارەکەم وام لێدێت بێزار ئەبم لە گیان.

لێرەدا دووبارە خۆی بەراورد ئەکات لەگەڵ مۆما، بەمۆم ئەڵێت تۆ ئەسووتێیت باشە با بسووتێیت، با شەو و ڕۆژ بسووتێیت، من بەتۆم وت تۆ سووتانت ئاشکرایە و من سـووتانم لەناو خـۆمـایە کـەواتە کـە ڕۆژهەڵات تۆ ڕووناکیـەکـەت ئاشکرایە و لەبەر ڕووناکی ڕۆژا ئەشاردرێیتەوە بەڵام ڕۆژیش هەڵبێ بەلای منەوە هیچە چونکە من لەناو خـۆمـا ئەسـووتێم دەروونم ئەسـووتێ لەبەر ئەوە ئەوانەی سـەرنج ئەدەنە دڵ و دەروون کڵپەی منیان لێوە دیارە. بەم جۆرە بەندی «مەم و مۆم» دوایی دێت.

***



## ئەوەی ئامانجمانە[1]

دوو جۆر ئامـانج ئەکـەوێتـە پێش دەمی مـرۆڤـە خـاوەن بڕواکـان لە تێکۆشانیـانا بۆ هێنانە دی مـەبەسـتـەکـانی بزووتنەوەی گـەلەکـەی، یەکـەم ئامـانجـە نزیکەکـان، دووەم ئامانجە دوورەکان، ئامانجە نزیکەکان: لە ئامانجە نزیکەکانی بزووتنەوەی گەلێک لە گەلەکانی جیهان پێویستە لە بزووتنەوەی نەتەوە ژێردەستەکان بدوێین، کە وتیشمان نەتەوە ژێردەستەکان باشتر و ڕاستتره ڕووبکەینە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە ڕووشمان کردە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ڕاستتر وایە ڕوو بکەینە (عیراق) کە ئیمڕۆ جێی تێڕوانینی گەلانی ئازادی جیهان و بەرەی ئیمپریالیزمە، یەکەم تێڕوانینێکی دۆستانە و دووەم تێڕوانینێکی دوژمنانە. وتمان ڕاستتر ئەبوایە ڕوو بکەینە عیراق کە ڕووشمان کردە عیراق ڕووەو ڕوومان دوو مەسەلە ئەوەستێ، گەلی عیراق بەشێوەیەکی گشتی بەکورد و عەرەبەوە، دووەم بەشێوەیەکی تایبەتی کە مەسەلەی کوردە. لەپێش هەموو شتێکا چە بۆ گەیشتنە ئامانجە نزیکەکان و چە بۆ گەیشتنە ئامانجە دوورەکان پیرۆزترین و بەتەوژم ترین پێویست جێگیرکردنی برایەتییە لە میـانی هەردوو نەتەوەکەدا، یا ئەم جێگیر کردنەش پێویستی بەخۆ کۆکردنەوەیەکی ڕێکخراو هەیە هەریەکە لە بارێکی ڕاست و ڕەوانی خۆیدا بۆ ئەوەی برایەتیەکە لەسەر بناغەیەکی پتەوی بەتین دابمەزرێ. بۆ گەڕان بەشوێن بەتین ترین و پتەوترین باری ئەم ڕێکخستنەدا پێویستە بگەڕێین بەدوی ئەو کۆسپانەدا کە ئەبنە هۆی پتەو نەبوون و ڕێک نەخستن. جارێ با بگەڕێین بەدوی کۆسپەکانی ڕێ پتەوگرتن و ڕێکخستنی نەتەوەی کوردا. یەکەم شتێ کە ڕێی یەکگرتنی زۆربەی گەلی کورد ئەگرێ لە بۆتەیەکی قاڵی ڕاست و ڕەوانی بزووتنەوەدا (چەوساندنەوە- استغلال)ە. کە وترا چەوساندنەوە مەبەست لە چەوساندنەوەیە لە میانی چینەکانی گەلی کورد لەگەڵ یەکدا. (چینی دەرەبەگ، فەلاح، بازرگان، سەرمایەداری بچووک، کرێکار، ڕۆشنبیر). ئەم چینانە بریتین لە گەلی کورد کە زۆربەی گەلی کورد، جا با بەراوردێک بکەین لەمیان ئەم چینانەدا و جۆری (استغلال) لە میان ئەم چینانەدا دەربخەین و بزانین (علاقە)ی ئەم چینانە پەیوەندیەکی ئاڵوگۆڕە لەگەڵ یەکتر یا چەوساندنەوەیە؟! لەپێشدا پەیوەندی چینی کرێکار لە کوردستاندا بگرین لەگەڵ چینەکانی تری گەلی کورد، پەیوەندی لە میانی چینی کرێکار لەگەڵ ڕۆشنبیر و بازرگان و فەلاح و سەرمایەداری بچووک و دەرەبەگ. پاش سەرنجدانێکی قووڵ بۆمان دەرئەکەوێ کە چینی کرێکار لەگەڵ ئەم چینانە پەیوەندیەکی ئاڵوگۆڕەرەوەی لەوەی ئنجا

(١) ڕۆژنامەی ژین، ژمارە (١٤٠٧) ١٩٥٨/٨/٢٨.

بەروادرێکی ئەم چینانە لەگەڵ یەکتر. فەلاح لەگەڵ کرێکار لەگەڵ ڕۆشنبیر لەگەڵ بازرگان لەگەڵ سەرمایەداری بچووک، کاسبکاران، دارتاش، ئاسنگەر، قۆندەرەدروو، کەبابچی، دوکاندار... هتد، تێکڕا پەیوەندیان لەگەڵ فەللاحدا پەیوەندیەکی ئاڵوگۆڕەرەوەی بەبێ چەوساندنەوەیە لەمەوە بیگرە هەموو چینەکان کە باس کرا بەسەرنجێکی وردە دەردەکەوێ کە پەیوەندیان تێکڕا لەگەڵ یەکتری پەیوەندیەکی ئاڵوگۆڕە تەنها چینی دەرەبەگ نەبێ لەگەڵ چینی فەللاحدا کە پەیوەندیان لەگەڵ یەکتر پەیوەندیەکی چەوساندنەوەیە. یانی تەنها فەللاح لەگەڵ دەرەبەگدا لە شەڕدان. تەنها فەللاح لەگەڵ دەرەبەگدا (تناقض) لەناویاندا هەیە ئەمە لەلایەکەوە کۆسپی هەرە گەورە وەکو وتمان چەوساندنەوەیە و دەریشمان خست کە چەوساندنەوە لە میان چینەکانی نەتەوەی کوردا بەتەنها لە نێوان فەللاح و دەرەبەگدا هەیە.

لەلایەکی تریشەوە، هۆی دووەم کە ئەبێتە هۆی یەک کەوتنیان (مصلحتی مشترک)ە لە میانی ئەم چینانەدا، یانی ئەو مەترسیانەی کە ڕوو دەکاتە زۆربەی میللەتی کورد وەکو ئیمپریالیزم، کۆنەپەرستی، چەوساندنەوەی نەتەوایەتی، نزمیی گوزەران، باری ئابووری و دواکەوتنی ئەم جۆرە بەڵایانەش تێکڕا ڕوو دەکاتە ئەم چینانە دەرەبەگ نەبێ. جا کەوا بوو کۆبوونەوەی چینی کرێکار، فەللاح، ڕۆشنبیر، سەرمایەداری بچووک، بازرگانی کورد لە بۆتەیەکی ڕێکخراوی دامەزراودا شتێکی ڕاست و ڕەوانە بۆ باری بزووتنەوەی نەتەوەی کورد. کە ئەمە یەکێکە لە گەورەترین ئامانجی نزیک. وە لەگەڵ بیروباوەڕی عیلمیدا زۆر چاک ئەگونجێ و جووتە. ئەم ئامانجە لەپێش چواردەی تەموزا، بۆ هێنانەدی چواردەی تەموز شان بەشانی برا عەرەبەکان شتێکی ڕاست بوو. وە هەر ئەم ئامانجەش بۆ پارێزگاری دەسکەوتەکانی پاش چواردەی تەموز شتێکی ڕاست و بەجێیە. ئەم یەک کەوتنەی نەتەوەی کورد لەو بۆنە مێژووییەدا شتێکی ڕاست بوو بۆ لەناوبردنی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی و چەوسانەوەی نەتەوایەتی و نزمی گوزەران هەر ئەم یەکگرتنەش شتێکی ڕاست بوو بۆ لەناوبردنی چەوسانەوە لە میانی فەللاح و دەرەبەگدا. کەوابوو گرنگترین و گەورەترین ئامانجی نزیکمان یەکگرتنی نەتەوەی کورد و ئێستەش یەکگرتنی نەتەوەی کوردە لەو دامەزراوە باسکراوەدا.

دووەم: ئامانجە دوورەکان:

کە وترا ئامانجە دوورەکان مانای خۆ هەڵگرتن نییە بۆ چەن سەدەیەکی دوور، چونکی لەم سەدەی پەلاماردانەدا بۆ داگیر کردنی (فضاء) و دروستکردنی مانگی دەستکرد ڕووداو وەکو برووسکە ئەڕوات جیهان لە گۆڕان و پێشکەوتنێکی بروسکەییدایە. ئەو



دەسکەوتانەی کە گەلان بەم چل ساڵەی دوایی هێنایانە دەس بەچەن سەدەیەک چواریەکی ئەو دەسکەوتانەیان دەس نەکەوتووە لە ڕابردوودا. جا بۆیە کە وتمان ئامانجە دوورەکان ئەوە ناگەیەنێ کە پشتی لێ بکەینەوە و پشوویەکی درێژ هەڵکێشین و بڵێین جارێ وەختی بیرکردنەوە نییە لە ئامانجە دوورەکان. چونکی وەک چۆن دواکەوتن زەرەرە هەروەهاش دواکەوتن لە بیرکردنەوەی ئامانجە دوورەکان زیانە لە نەتەوە دەکەوێ.

وتمان گەورەترین ئامانج یەکگرتنی نەتەوەی کوردە لەو دامەزرانەدا و فەلسەفەی ئەو دامەزرانەش پتەو کردنی برایەتیە لەمیان کورد و عەرەبدا بۆ لەناو بردنی ئەو بەڵایانەی کە ڕووی کردۆتە هەردوولا وەکو ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی و نزمی گوزەران بێ وە لە کاتێکا سوپای نەبەزی عیراق بەپشت گرتنی هەردوولا لە ناکاو شێرانە بەڵاکانی یەکەیەکە کە لە ڕەگ ترازان و پوخت خستیە بەردەستی هەردوو نەتەوەکە. بێ گومان و بێ دوو دڵی پێویستی سەرشانی هەردوو نەتەوەکەیە بەجووتە باوەش بکەن بەجمهوریەتە پیرۆزە ساوایەی عیراقدا و کەمەری ببەستن و چی لە توانادایە بیخەنە بەردەستی ئەم جمهوریەتە خۆشەویستە و هەموو کەسێکی هەردوو نەتەوەکە ببێتە سەربازێکی وریا و چاوکراوە بۆ خۆ بەختکردن. بۆ ئەوەی وا بچەسپێ وڵات پاک بکاتەوە لە تڵپەی دامودەزگای کۆن و فەرمانە سیاسیە ئابوریە کۆمەڵایەتییە خوێندەوارییەکانی تێکڕا بەرامبەر بەگەلی عیراق بیهێنێتە دی و ببێتە هێزێکی سەخت بەرامبەر بەئیمپریالیزم و کردارە ڕەشەکانی. لێرەدا شتێکی گەورە بەرچاوی هەموو مرۆڤێکی خاوەن بڕوا دەکەوێ کە بەهێنانەدی نزیک دەکەوینەوە لە ئامانجە دوورەکان.

***

## سالم(١)

یەکێکە لە شاعیرە ئاڕاستەکارەکانی نەتەوەی کورد، خاوەنی تەرازووی قافیە و وردکاریە لە شیعری کوردیا. لە کاتێکا خوێندنمان، زانیاریمان، ڕێی شوناسی زمان و ئەدەبیمان کەوتبێتە سەر ئەوەی خوێندن و زانیاری و شوناسی زمان و ئەدەبی خەڵکی تر بکەین بەماڵ لەسەر خۆمان، نەک هی کورد وە ئەم لەسەر خۆماڵ کردنەش بمانەوێ یا نەمانەوێ دابڕابێ بەسەرمانا، هیچ دوور نییە دووریش نابینرێ کە شاعیر و ئەدیبەکانی خۆمانمان تا ڕادەیەکی دوور و درێژ لە بیرچووبێتەوە. جا ئەو بیرچوونەوەیە لەبەر هەچ

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١٣٤٠) ١٩٥٧/٤/١١ (بەشی یەکەم). ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١٣٤٢) ١٩٥٧/٤/٢٥ (بەشی دووەم).

هۆیەکی تریش بێ شتێکمان پێ نیشان ئەدات، ئەویش ئەوەیە کە ئاگامان لە ئەدەبی نەتەوایەتی خۆمان نابێت ئەو ئاگا لێ نەبوونەش لە ڕاستیا نەک تەنها نەنگیە بەڵکو مەترسیشی هەیە ئەگەر قووڵ لێی وردبینەوە چونکی ئاگا لێ نەبوونمان لە ڕابردووی ئەدەبی نەتەوایەتیمان مانای ڕۆچوون بەناخی دان بەتواندنەوەنانی یەکێ لە گرنگترین پایەی نەتەوایەتیمان کە (ئەدەبە)، بۆچی ڕێ بدەین بەتواندنەوە با کۆسپیش بەر لووتمان بگرێت! بۆچی ڕێ بدەین بە لە بیرچوونەوەی سووچێکی گەورە لە مایەی شانازی نەتەوەکەمان، بۆچی نەیەین لە شیعرەکانی سالم بدوێین بۆ لێی نەکۆڵینەوە، بۆ نەیخەینە پێش چاوی لەپێشا خۆمان و ئنجا خەڵکی تر!

با بزانین (سالم) هەر وتوویەتی:

ئەمەوێ مەستی بادەبم دایم
پای خۆم ئوفتادەبم دایم

یا وتوویەتی:

ئەگەرچی سینە بۆ دڵ وەکو سوپەر بوو
وەلێ زەخمی خەدەنگ کاریگەر بوو

یا:

مەهی پارس زوبانم گفت سالم شرحی حالت کو
وتم جانابە لە دینم اصطلاحی ئێوە من کوردم

جارێ لەپێش ئەوەدا بێینە سەر ئەوەی بڵێین: (سالم) شاعیرێکی ئاراستەکارە یا بڵێین شاعیرێکە هەستی نیشتمانپەروەری گەیشتۆتە ڕادەی کزە لە جەرگ هەڵسان. با بێین تۆزێ لەو کاتە بدوێین کە سالم شیعری تێدا ڕێکخستووە: لە کاتێکا سالم یەکێک لە خاوەن بنەماڵەکانی کوردستانە، مەبەستیشمان ئەوەیە دەبوو کە هەستی بەکەموکوڕی کەمتر کردبێ مانای ئیلتیزام لە شیعرەکانیا کەمتر دەبوو ببینرایە، کەچی بەپێچەوانەی ئەمە لە وەڵامی قەسیدە بەسۆزەکەی (نالی)یا ئەوپەڕی هەست بەکەموکوڕی کردن و گوێ نەدانە نرخی ژێردەستی دەردەخات ئەمەش تەنها بەس نییە بۆ وردبوونەوە لە (محیطی) ئەوسای سالم، چۆن؟ لە کاتێکا سالم یەکێک بووە لەسەردەمێکا ژیاوە دەستەی ڕۆشنبیر نەهاتۆتە گۆڕێ لە کوردستاندا، یانی سەرمایە نەنێرراوە بۆ جێگاکانی کە پاش ئەم کەین و بەینە دەستەی ڕەوشنبیر دروست ئەبێ و باری بزووتنەوەی گیانی سەربەخۆیی نەتەوایەتیان ئەکەوێتە کەللە، یانی هێشتا داگیرکەر بە(مەفهومێکی عیلمی) نەکەوتبووە ئەم پەڕ و ئەو پەڕی کوردستانەوە کەچی



سالم ئەڵێ:

مهی پارس زوبانم گفت سالم سرحی حالت کو
وتم جانا بەلەدینم اصطلاحی ئێوە من کوردم

کەوا بوو سالم یەکێکە لە ڕائدەکانی بیرکردنەوەی هەستی نەتەوایەتی چۆن؟ لە نووسراوە بەسۆزەکەی «نالی»یا:

قوربانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مرور
ئەی پەیکی شارەزا بەهەموو شاری شارەزوور
ئەی سروەکەت خەفی و هەوا خواهو هەمدەمە
وەی لوتفەکەت بەشارەتی هەر گۆشەی حضور
ئەم هەم مزاجی ئەشکی تەڕ و گەرمی عاشقان
طوفانی دیدە و شەرەری قەلبی وەک تەنوور

لە وەڵامی ئەم قەسیدە بەسۆزەی نالییا کە پڕە لە هەستێکی خاوێن و سۆزێکی ئاگراوی لە دوورەوە بۆ نیشتمان. لە وەڵامی ئەو قەسیدەیە پڕ لە کڵپەی هەستکردن بەدووری لە نیشتمان ئەو خاکەی کە مرۆڤی تێدا گۆش ئەکرێ لە وەڵامی قەسیدە تێکەڵ بەنیشتمانپەروەرێتییا (تعبیر)یشی تەواو نەکردبێ لەو مەبەستە سالم لە وەڵامی قەسیدە بەسۆزەکەی نالییا ئەو قەسیدەی کە پڕە لە هەستی تاسەی نیشتمان و ڕای ئەکێشێ بۆ هەواڵ پرسینی هەموو جۆرە شتێ کە بەجێی هێشتووە. پردی سەر شەقام، داری پیرمە سوور، داری شێخەباس، حوجرەکەی ئاوی سەرچنار، سەیوان، دەشتی کانی ئاسکان و هاوڕێکانی. لە وەڵامی ئەو قەسیدە بەسۆزەی «نالی»یا سالم ئەڵێ:

جانم فیدای سروەکەت ئەی بادەکەی سەحەر
ئەی پەیکی شارەزا بەهەموو ڕاهی پڕ خەتەر
ئەی مروەحەی جەمالی مەه ئاسای دولبەران
وەی شانەزەن بەکاکۆڵی تورکانی سیم بەر
جا ڕووکەش منازلی جانان لە خەڵوەتا
فداشی فەرشی ئەبری بەهاران لە دەشت و دەر

یانی: بەرامبەر بەپەنا بردنی بۆ (با)ی خوارو ژوورکەر و سەرو خوار پشکنی و پێی ئەڵێ، ئەی (با) گیانم بەقوربانی ئەی تەی کەری شارەزای هەموو شاری پڕ لە مەترسی مەبەستی (سولەیمانی)یە و لە مەڵبەندی کوردستانی ئەوسایە پاش هاتنی تورکەکان و

داگیرکردنی ئەم وڵاتە! گیانم فیدای سروەکەت ئەی بادەی بیانی، ئەی باوەشێنی جوانی ئەو جوانانەی کە ڕوویان وەکو مانگ وایە، ئەی شانەکەری پرچی ئەو نازدارانەی کە قەدیان وەکو سیم باریک و ڕێک هەڵچووە، ئەی پاککەرەوەی جێگای جوانان لە تەنهاییدا لە کاتی خۆ ئارایشت دانا، لە تۆز و گەرد و هەناسەی دووکەڵاوی، ماوەی ڕادەری هەوری بەهاران و کۆکەرەوەی لە دەشت و دەرا. با جارێ یا تۆزێ لەم پێشەکی وەڵامە وردبینەوە، شاعیر هەر ئەوەندە ئەتوانێ بەسەر و باڵی (با)دا هەڵبدات هەر ئەوەندە ئەتوانێ خەریکی ڕازاندنەوەی باخچەی مەبەستی بێ. لەپاشا دێتە سەر وەڵام و ئەڵێ:

پرسیوتە ظاهرا لە ڕەفیقانی یەک جهەت
ئەحواڵی ئەهلی شەهر و ڕەفیقانی سەر بەسەر
لەو ساوە کە حاکمی (بابان) دەربەدەر کران
نەی دیوە کەسێ لە چارەی کەس جەوهەری هونەر
تابو بەجایی مەتلەعی خورشیدی بەختی ڕۆم
سووتا گیا و تووشنە و خوشکید بوشمەر

مانای: پرسیوتە لە هاوڕێکانی کۆنت، هاو دانیشتنەکانت، هەواڵی خەڵکی شار و هاوڕێکان تێکڕا، لەوساوە کە حاکمانی بابان نەمان، یانی پاش شەڕ و گرتنی سولەیمانی و ئەم ناوچەیە و یەخسیر کردنی بنەماڵەی بابان و ناردنیان بەدیلی بۆ تورکیا و هەڵکردنی ئاڵای ڕۆم (واتە- تورک) لە جێی ئاڵا ناوچەییەکەی کوردستان، هیچ کەس نەی دیوە لە چارەی کەس جەوهەری هونەر. لێرەدا تەفسیری ئەم شیعرە ئێمە وای لێک ئەدەینەوە هونەر ئەبێ خزمەتی هۆز و گەل بکات، لەپێشا گەلی ئەو خاوەن هونەرە کە وابوو لە کاتێکا بێگانە بێتە جێی خۆ هونەر هەر ئەوەندەی پێ ئەکرێ خۆی بشارێتەوە نەک لەبەر هەڵاتن و لە ترسا بەڵکو لە (ڕقا) لەپاشا لەو کاتەوە کە وڵات بووە بەجێی هەڵهاتنی بەختی ڕۆم و ڕۆژی حاکمانی بابان ئاوا بووە گیای سەوزی بەهاری وڵات سووتا و بەری درەختەکانیش تێکڕا وشک بوون. بەم شیعرەدا پارچەیەک لە (مارسیلیز)م بیر ئەکەوێتەوە کە ئەڵێ: (هێرش هێنەرەکان، بەرەو نیشتمانمان کشان، پێڵاوەکانیان گوڵی باخەکانمانی ئەپلیشانەوە و گڕی تۆپەکانیان بەری درەختەکانمانی وەران و ڕەشی داگیرسان). لەپاشا ئەڵێ:

وەک پیری ساڵخور دەخەمە داری پیرمەسوور
مەشغوڵی لغزشە همە جاپای تا بەسەر



شارێکی پڕ لە زوڵم و مەکانێکی پڕ لە شین
جاییێکی پڕ لە شوور و وڵاتێکی پڕ لە شەڕ
سەربانی پڕ لە کەژ دوم و دیواری پڕ لە مار
کۆڵانی پڕ لە زەرەن و سەحرای پڕ خەتەر

ئەفەرمووی: وەکو پیری ساڵ خواردوو، ساڵ خواردوو، کەوابوو ساڵ خۆرەیە و وردە وردە مرۆڤ ئەخوات تا ئەی کوژێت. لە ڕاستیا تەعبیر هەر ئەوەندە ورد ئەبی، وەک پیری ساڵ خوردە چەماوەتەوە، داری پیرمەسوور، خەریکی لوغز خوێندنەوەیە لە سەرەوە هەتا پێ، لێکی ئەداتەوە، ئەم وڵاتە بۆ وای لێ هات؟ چی وای لێکرد؟ چارمان چییە؟

شارێکی پڕ لە ستەم و جێگایەکی پڕ لە شین، جێگەیەکی پڕ لە هەراو ئاشوب و وڵاتێکی پڕ لە شەڕ. کەواتە دەبێ پێش ڕووخاندنی ئەمارەتی بابان و تێکچوونی ئەبێ شار پڕ لە ئاسوودە بووبێ و دوور لە ئاژاوە و دەردی سەری بووبێ کە ئەمەش نرخی، سەربەخۆییمان نیشان ئەدات. ئەڵێ پاش تەفروتوونابوونی دەسەڵاتی ناوچەیی خۆمان سەربان پڕ بووە لە دووپشک و دیوارەکانی پڕ لە مار و کۆڵان پڕ لە ڕێگر و جەردە و دەشتیش پڕ لە مەترسی.

لەپاشا ئەڵێ:

نایێ سەدا لە حوجرەکەت جز فغانی جفد
غەبرەز مقامی قوو ڕێ نییە شوێنی پێ گوزەر
توخوا بڵێ بەحەزرەتی نالی دەخیلی بم
بەم نەوعە قەد نەکا بەسولەیمانیا گوزەر
سالم سیفەت لەبێ کەسیا با نەبێ هیلاک
من کردم و ئەو نەکا لە خەما خوێنی خۆی هەدەر

ئەڵێ، ئەحواڵی حوجرەکەتت پرسیبوو، بەڵام ئێستە لە قریشکەی بایەقووش بەولاوە هیچ دەنگێکی لێ نایەت بەمانای بووە بەکەلاوە و لە جێی (شەوگەرد) بەولاوە شوێنی دانانی لێ نەماوە. توخوا ئەی شەماڵی بەیانیان بڵێ بە نالی دەخیلی بم بەم ڕەنگە هەرگیز بەسولەیمانیا نەڕوات. با وەکو سالم بێکەس و بێ دەرەتان و شەکەت نەبێ. من وام کرد و خۆم دا بەدەم ئەم گێژاوی ژێر دەستییەوە، دەخیلی بم، ئەو لە دەرد و خەما خۆی نەدۆڕێنێ!.

***

## پیرەمێرد(١)
### شاعیری بزووتنەوەی نیشتمانی کوردە

ئەگەر سەرنجێکی نەختێ قووڵ بدەینە (وێنە)ی پیرەمێرد، ناوچەوانێکی تۆزێ بۆ پێشەوە هاتوو کە لە ڕاستیدا لە ناوچەوانی (سوکرات) ئەچێ، دوو چاوی تیژی تەمەن و وردبوونەوە کە لە چاوی (ڕۆسۆ) ئەچێ، سمێڵێکی پڕ لێو کە تەواو پیاوە بەساڵاچووە دەرد و ئازارچێژەکانی کوردستانمان، ئەهێنێتە پێش چاو، بەکورتی تێکڕا سەر و چاو و دەم و لووت و لۆچەکانی ڕوومەتی کەللەسەری یەکێ لە بیرکەرەوەکانی جیهانمان ئەهێنێتە پێش چاو. جارێکیان لە دانیشتنێکی ئەدەبیا باسمان لە پیرەمێرد ئەکرد. باس لە شیعری لە زانیاری زمانی لە (شۆڕش) لە شیعرەکانیا، یەکێ لە شاعیرەکانمان لەو دانیشتنەدا بوو وە لەو بڕوایەدابوو کە پیرەمێرد بە(شەخسیەتێکی) دوو دڵ ئەژمێررێ لە شیعری کوردیا تەنانەت (حرفیا) وای وت:

(مثال الشخصية القلقة في الادب الكردي) پرسیم چۆن؟ بەڵگەت چییە؟ گەڕا بۆ بەڵگە بەڵام بەڕاستی نەیتوانی تێم بگەیێنێ کە ڕاست ئەکات وتم پیرەمێرد بەپێچەوانەی تۆ من ئەڵێم شاعیری بزووتنەوەی نیشتمانی نەتەوەی کوردە وتی چۆن؟ وتم: ئەگەر بێین لەلاپەڕەکانی دیوانەکەی پیرەمێرد وردبینەوە، لەو کاتەوە کە دەستی کردووە بەنووسین و شیعر دانان لە گۆڤاری (ڕۆژی کورد)دا کە لە ئەستەموڵ لەپێش هەڵگیرساندنی شەڕی یەکەمی جیهانیا دەردەچوو تا گەڕانەوەی بۆ سولەیمانی و دەرکردنی چەن گۆڤار و ڕۆژنامەیەک کە بە(ژین) دوایی بەژیانی ئەو هێنا، بۆمان دەرئەکەوێ پیرەمێرد نەک تەنها شاعیری بزووتنەوەی نیشتمانی نەتەوەی کوردە بەڵکو شاعیری میللەتی کوردە. ئەڵێ:

کورد نابڕێتەوە خەیاڵی خاوە
بەراتی نەجات بەخوێن نووسراوە

بەڵێ کورد نابڕێتەوە! چونکە گەلان نامرن، ئەگەر وەک پیرەمێرد نرخی گەل بزانین. پاش ئەوەی زۆر لە گەلە بێ قەوارە و بێ چەکی خۆ پاراستنەکان لە ناو چەن گەلێکی ترا توانەوە، وەک (ئەتروسک و غالیین) لە ئەوروپا و لە ڕۆژهەلات، وەک (زط و قرمط) و هەن بەرەو تواندنەوە ئەڕۆن وەک ئاشووری و کلدانی، مانەوەی کورد بەو گوزەرانەی کە کردوویەتی وە بەو هەموو دەردی سەری و برینانەوە، ئەڵێم مانەوەی کورد وەک ئێستا هەیە بەڵگەیەکی هەرە گەورەیە بەدەستمانەوە کە ئێمەش لەگەڵ پیرەمێردا

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١٣٤٤) ١٦/٥/١٩٥٧.



بڵێین (تازە کورد نابڕێتەوە) خەیاڵی خاوە. ئەمە لە لایەک لەلایەکی ترەوە بەراتی نەجات بەخوێن نووسراوە. لەپلەی یەکەمدا کورد نابڕێتەوە خەیاڵی خاوە لەپلەی دووەمدا هەر ئەبێ ڕزگاربێ، بۆچی؟ ئەگەر وەک زانیومانە بەراتی (ئازاد بوون) لە گوناه بەکردەوەی باش کردن و بەخشینە لەلای خوا، کورد بەراتی ڕزگاربوونی بەخوێن نووسراوە، بەخوێنی ڕۆڵەکانی، پیاوەکانی، قارەمانەکانی، ئافرەت و کچەکانی، دەبا بەرزکرێتەوە بەراتی نەجات کە سوور و ئەڵوەندە. کورد بەراتی نەجاتی بەخوێن کڕیوە و نووسیویەتی. لە قەسیدەیەکی تردا ئەڵێ:

ئەو ڕەنگە سوورە بوو کە لە ئاسۆی بڵندی کورد
مژدەی بەیانی بۆ گەلی دوور و نزیک ئەبرد

لەپێشا وتمان بەراتی نەجات بەخوێن نووسراوە، کە ڕەنگێکی سووری ئەرخەوانییە، ئەو ڕەنگە سوورە بوو ئەو خوێنە ڕژاوەی کە تێکەڵ بوو بەئاسۆی دەم چیا بەرزەکانی کوردستان و شەوقی خستە ناو دونیای هەموو گەلانەوە. ئەو گەلانەی کە وەک نەتەوەی کوردن و پێی وتن هەستن لە خەو ڕاپەڕن، بەیانە، وا ڕۆژهەڵات، وا کاتی فرمان هات، بەسە بێداری و سستی و چاو قوچاندن. هەستن ئێوەش وەکو ئێمە خوێنتان تێکەڵ کەن بەئاسۆکانتان. هەستن وا موژدەی بەیانمان بۆ هێنان. مژدەی ئەنجامی خەبات و تێکۆشان مژدەی ئەنجامی ئەو ئەرک و تەقەلایەی کە ئێمە بەخوێن لە ئێوەی ئەگەیەنین ئاشکرایە. بزووتنەوەی گەلان بریتییە لە زنجیرەیەک کە ئەم ئەڵقەی بەو ئەڵقەوە نووساوە کەوابوو خەباتی کورد پشتگیری و مژدەیەکە بۆ گەلێکی تر دوور بێ یا نزیک. عەرەب بێ یا ئەندەنووسی. پشتگیری و موژدەیەکە بۆ خەبات و ڕزگاری میللەتی کورد. لە قەسیدەیەکی ترا ئەڵێ:

قوربانی ئێمە ئەسڵە لە گشت لا پەسەنترە
قوربانی حاجیەکان مەڕە ئێمە کچ و کوڕە

قوربانی ئێمە ئەسڵە، هی ئێمە ڕاستییە، چونکی ئێمە قوربانییەکانمان کچ و کوڕەکانمانن، ئێمە کچ وکوڕەکانمان بەخت ئەکەین بۆ ئازادکردنی گەلەکەمان بۆ بەختیاری و کامەرانی دواڕۆژی نەتەوەکەمان. ئەگەر قوربانی حاجیەکان تەنها مەڕە، ئێمە خۆمانین، کورد، کە خۆی بەخت ئەکات بۆ ڕزگاربوونی. با بێین لەگەڵ شۆڕشگێڕترین قەسیدەی (جواهري) یا (أبو القاسم الشابي)یا ئەم شیعرە بەراورد بکەین بزانین تینی کامیان سووتێنەرترە!.

***

# پیرەمێرد(١)

# ٢

**١٩٥٧**

*(بەبۆنەی تێپەڕینی حەوت ساڵ بەسەر کۆچی دوایی شاعیری بزووتنەوەی نیشتمانی کوردا)*

دوێنێ، نۆزدەی حوزەیران، پێش حەوت ساڵ، بیرکەرەوەیەکی وچان نەدەر، نووسەرێکی تیژبین، تێکۆشەرێکی کوردایەتی، شاعیرێکی شۆڕشگێڕ، زیندووکەرەوەیەکی جەژنی نەتەوەی کورد هەردوو چاوی لێک نا، بەلێکنانی ئەو دوو چاوەی کە گەردی گێژەڵووکەی دەردەی سەری و ئازاردانی کە لەمێژەوە بەسەر کوردستانا دێت و ئەڕواو لەهەر هەڵکردنێکا چەند گەلایەک لە درەختی ڕۆڵە و پیاوەکانی کورد هەڵئەوەرێنێ، گێژەیەک کەوتبووە سەر گلێنەکەی بەلێکنانی ئەو دوو چاوەی کە لە چاوەکانی «ڕۆسۆ» ئەچوو، دڵیشی لە لێدان کەوت ئەو دڵەی کە لە تافی گەنجێتییەوە تا ئەو ڕۆژەی مەڵبەندی (یارە)ی کرد بەجێی پشووودانی دوایی. بۆ کوردایەتی ئەجۆشا، ئەسووتا، ئەگریا، هەڵئەپەڕی. دوێنێ کە نۆزدەی حوزەیران بوو، پیرەمێرد حەوت ساڵ تێ ئەپەڕی بەسەر کۆچی دواییدا. ئەشێ پیرەمێرد و کورد خۆشەویستەکان وەک خنکاوی بۆ چڵەپووش پەنابەر دەستیان بۆ ئەملاو لا درێژ کردبێ لەبەر نەتەوەی کوردی خەریکی خنکاندن. بۆ ئەملاو لایەکی (بێزراو) لای نەتەوەی کورد. بەڵام مێژوو نیشانی دا کە دوو جۆر پیاو لەگەڵ ئەملاو لای (بێزراوا) هاوکاریان کردووە، جۆرێکیان لەبەر (کورد) جۆرەکەی تریشیان لەبەر ئەو (بێزاراوە). وەکو وتمان مێژوو نیشانی دا کە پیرەمێرد و چەندانێکی تر لەبەر کورد و بۆ کورد ژیان و مردن. دوێنێ نۆزدەی حوزەیران ڕۆژێکی تەماویە لە لاپەڕەی مێژووی گەلی کوردا. مانگێکی ڕەش و ناسازە لە مێژووی گەلی کوردا. مانگی حوزەیران مانگی لە کیس چوونی گەلێ لە پیاو و ڕۆڵە نەبەردەکانی نەتەوەی کورە، کەلێن و برینی تا ڕادەیەک دیاری کردۆتە جەستەی ئەم گەلە نەبەزەی کە گەلێکە لەگەڵە خەباتکەرە قوربانیدەرەکانی جیهان. ئەگەر ئەم نەتەوەیە لە هەنگاوەکانیا بۆ گەیشتنە ئامانجەکانی تووشی (نوچ) بووبێ مانای ئەوە نییە ئیتر دەردی ورەبەردان بەئێسک و مۆخیا بچێتە خوارێ و تەمای گەشەی گوڵی ئاواتە پەستێوراوەکانی نەمابێ. نۆزدەی حوزەیران، یادی تێپەڕینی حەوت ساڵ بەسەر

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١٣٤٩) ڕۆژی ١٩٥٧/٦/٢٠.



ماڵئاوایی، بەڵێ لە کاتێکا نیگارێکی پڕ سام و ترسناکە لای هەندێ خواردنەوەیەکی بەگەشەیە لای ئەوانەی ئەیڕێژن، کەچی لای ئەوانەی لێیان ئەڕژێ (خۆشە، جوانە، سوورە، ئەرخەوانییە) بۆچی؟ چونکی ڕەنگی سوورە کە لەدەم ئاسۆدا دیاری دا، مژدەی شەبەق و ڕۆژ بوونەوەیە بۆیە پیرەمێرد ئەڵێ من خوێنی ڕژاوی ڕۆڵەکانی کوردم لا خۆشەویستە، لا جوانە، چونکە ئەو خوێنە ڕژاوە مژدەی شەبەقی ئازادی کوردستانم بۆ دێنێ. دوێنێ نۆزدەی حوزەیران ڕۆژی تێپەڕینی حەوت ساڵ بەسەر کۆچی دوایی (پیرەمێرد) کە گومانی تێدانییە ئەبێ ببێتە ڕۆژێکی مێژوویی لە لاپەڕەی ڕابوردووی گەلی (کوردا) چونکە سۆز و نیشتمانپەروەری بیرەوەری پیرەمێرد گەیشتۆتە سنووری ئەڵێ:

ئەو ئاگرەی لە دڵمەوە بەر دەبێتە کفنەکەم

تا دوژمنم نەکا بەخەڵووز شەرتە پف نەکەم

ئەو جۆشی کورایەتییەی لەناو گۆڕیشا پاش سووتاندنی جەستەم بەرئەبێتە کفنەکەم، تا نەیەتە دەرێ گەلەکەم نەبینێ نەیکا بەمەشخەڵ ڕێ ڕووناک نەکاتەوە و هێرشی پێ نەباتە سەر دوژمن نەیکا بەسووتنوو پەیمان بێ فووی لێ نەکەم و نەی کوژێنمەوە.

***

# نیزامی گەنجەوی(١)

**١٩٦٩**

ئەو سەرچاوانەی بۆ ئەم باسە سوودیان لێ وەرگیراوە:

١- شەرەفنامە: ئەمیر شەرەفەدین خان

٢- خلاصەی تەئریخی کورد و کوردستان: محمدأمین زەکی بەگ

٣- خوسرەو و شیرین: چاپی باکۆ

٤- کلیات نظامی: چاپی تاران

٥- نظامی شاعر الفضیلە: الدکتور عبدالمنعم محمد حسنین

هەوڵدانێ بۆ ناسینی: ئەشێ لە مێژوودا جۆرە پیاوێکی ناودار هەبێ کە ساخکردنەوەی بەسەر نەتەوەیەکدا هیچ جۆرە قازانجێک نەگەیەنێ بەو نەتەوەیە با بەئیمڕۆی ئەو نەتەوەیە، پێویست ناکا ناو هەڵدرێ. بەڵام ناسینی بلیمەتێکی وەکو

(١) گۆڤاری ڕزگاری ژمارە (٧) ساڵی یەکەم ٢١/ئەیلولی/١٩٦٩. بەشی دووەم ژمارە (٩) ٢١ی کانونی یەکەم ١٩٦٩.

نیزامی و ساخکردنەوەی بەسەر نەتەوەی کوردا مانای گەشەداری و گرنگیی مێژووی ڕابردوومانە. ئەم شاعیرە گەورەیە کە بڕوای زۆربەی شاعیرانی فارس زمان وایە کە یەکە شاعیری دونیایە بڕوای هەندێکیان وایە کە خواوەندی.

شوعەرایە. ئەڵێن ساخکردنەوەی ئەم کۆ کاری کەرەسەی کۆن و تازەی شیعرە. ئەو دەرگای بیرکردنەوە و خەیاڵی وردە. بەسەر نەتەوەی کوردا سەرمایەیەکی هونەری شیعری بەسروشت لە نەتەوەکەمانا دروستبوو ئەگەیەنێ. سەرنجدانێکی ورد لە نەتەوەکانی جیهان و شانازی پێوەکردنیان بەمیراتیە نەمردوەکانیانەوە پتر ڕامان ئەکێشێ بۆ ئەوەی ئێمەش وەکو نەتەوەیەکی هاوبەشیکەر لە دروستکردنی شارستانیەت (حضارة)دا هەقمان هەبێ لەشت بدوێین. بێینەوە سەر نیزامی، تەماشا کردنێکی ڕێکخراوە شیعرەکانی وەکو (مخزن الأسرار، خسرو و شیرین، مجنون و لیلی... هتد) بەڵگەی بێ لێدوانی وشەکانی سەرەوەیە. مرۆڤی چەند سەدەیەک لەمەوبەر داواکاری خۆشەویستی ڕاستەقینە و دەس و دڵپاکی و زمانپاکی و کورنوش نەبردن بۆ دروستکەر، نەبێ بۆ هیچ کەسێ نەبردن و خەڵکی هاندان بۆ خوێندەواری و زانست و بایەخ پێ دان و ئامۆژگاری کردنی دوور کەوتنەوە لە هاشە و شتی بێ بناغە و شانازی کردن بەدایک و باوکەوە و دەربڕینی ئەو شانازیانە بەئاشکرا. ئەم جۆرە پیاوانە ئیمڕۆ نەک قازانج بەنەتەوەیەک ئەگەیەنێ بەڵکو پشوودانێکە بۆ دونیای بەیەکا هاتووی مێژوو پشکنین شەرابێکی تەزوو دەرە بەناخ و دەروونی ئەو کەسانەی بەریی هەوراز و سەختی ڕابوردووی نزیک و کۆنمانا بۆ ئەنجامی ڕاست و ڕەوان نیشاندانی ئەم نەتەوە قارەمانە.

سۆڤیەت و نیزامی- لە حوزیرانی ١٩٦٣دا لە باکۆ پایتەختی ئازربایجانی سۆڤیێتی کۆنگرەی ڕۆژهەڵاتناسانی یەکێتی سۆڤیەت بەسترا جگە لە ڕۆژهەڵاتناسانی سۆڤیەت کۆمەڵە شارەزایەک لە شیعر و مێژووی گەلانی ڕۆژهەڵات بەشدار و بانگ کرابوون بۆ ئەو کۆنگرەیە، لە ڕۆژی دوان لە هونەر و شارەزایی، قسە گەرم بوو وە بەگەرم بوونیشەوە نەوەستا گەیشتە جۆشین، هەندێ لە شاعیر و شارەزاکانی ئازربایجان، ئەیان وت نیزامی ئازربایجانییە، دەستەیەکیش لە ئەندامانی ئەیان وت نیزامی تادجیکیە و فارس زمانە و شیعری بەزمانی فارسی وتووە و لە (قوم)ی نزیک تارانی ئێستاوە ڕەویان کردووە و چوونەتە (گەنجە). لە کاتی پشوودان لە کۆنگرەکە یەکێکی کورددۆست بەیەکێ لە ئەدیبەکانمانی وت: ئەگەر مەسەلە بێتە سەر ئازربایجانی و فارسی زمانی یا ئێرانێتی من ئەیدەم بەئێوە!.



بەم جۆرەی کە لەسەرەوە باس کرا چەند دانیشتنێک لە کۆنگرەکە خەریک بوو بەنیزامیەوە وە هەر بەو جۆرەش دەزگای مێژووناسی سۆڤیەت لای مەبەست بوو کە ئازربایجانی بێ یا تادجیکی فارسی زمان وە جگە لە ڕێز هەستی هەڵسەنگاندنیشی بەرامبەر ئەگیرا و ئەو مرۆڤە جێگای سەرنج و لێ وردبوونەوە بوو.

نیزامی کێیە؟!: ناوی (ئەلیاس و لەقەبی نظام الدین کوڕی یوسف کوڕی زەکییە) تخلصی شیعریەکەی نظامییە، هەر چەندە هەندێ لە زاناو زاناکانی شیعری فارسی ئەڵێن ناوی (وەیسە). دەربارەی لە دایک بوونی چەند قسەیەک هەیە بەڵام ئەوەی لە ڕاست ئەچێ بەگوێرەی ڕێکخراوە شیعرەکانی وەکو (اقبال نامە، ئەسکەندەرنامە) وا دەرئەکەوێ کە لە ساڵی (٥٣٩)ی کۆچیدا لە دایک بووبێ و لە ساڵی (٦١١)ی کۆچیدا گەیبێتە ئارامگای گۆڕ. بەم گوێرەیە ئەبێ شەست ساڵێ تەمەنی بووبێ. نیزامی ڕێ و ڕوینێکی ئاینیانە پەروەردە بووە هەمو جۆرە بابەتەکانی (علمي فقهي) خوێندووە و شارەزاییەکی تەواوی لە (قورئان)دا بووە. لەپاشا دەستی داوەتە ئەستێرە شوناسی. هەر چەن هەندێ لەو بڕوایەدان کە زۆر بڕوای پێ نەبووە (فەلەکیات و جوگرافیا)ی ئەو دەمەی قووڵ خوێندۆتەوە. لە تصوفدا دەستێکی سپی درەوشەداری بووە لەگەڵ ئەوەشا هەندێ لە شارەزاکانی ئەڵێن! نەء تەنها گۆشەگیری و بیرکردنەوەی پێخۆش بووە. نیزامی ڕێ و شوێنێکی دیار بووی هەبووە لای دەسەڵاتدارانی ئەوسا، دەروون پاک و بێ گرێ و بەرزبووە. ئامۆژگاریکەری ڕاستگۆیی و نەفرەتکەر بووە لە چەوت گۆیی دژ بەشەڕ و شۆڕ و فیتنە ئەنگێزی بووە. چەن بەسەر خۆیدا هەڵی دابێ و شانازی کردبێ بەشیعرەکانیەوە ئەوەندەی لە زانیاری خۆی نیشان داوە بەرامبەر بەخواپەرستی. خوێندنەوەیەکی زۆری بووە دەربارەی پزیشکی ئەو سەردەمەوە بەهەندێکی کاری کردووە وە جۆرەها دەرمانی لە گژوگیای چیا دروست کردووە. ئاگای لە کرداری ڕۆژانەی خەڵک بووە. ڕێزی لە خووڕەوشتی باش گرتووە و بێزی لە کرداری بەد کردۆتەوە. هاندەری خەڵکی بووە بۆ جم و جووڵ و وەرزش. نیزامی هەمیشە بەدووی خوێندنەوەدا گەڕاوە و ئەڵێ: لە چەن دێڕێکی کوژاوە چەند وشەیەکم دەرهێناوە و لە چەند لاپەڕەیەکی پەڕپووت چەند دێڕێک و لە چەند کتێبێکی کۆن چەند لاپەڕەیەک. زمانی عەرەبی و فارسی زۆرباش زانیوە، خەڵکی هان داوە بەشیعر کە لە بەندەگی پاشاکان وازبهێنن، چونکو لای ئەو نزیک بوونەوە لە پاشاکان وەکو (لۆکەی وشک بردنە بەردەمی ئاگرە) و کورنوش تەنها بۆ دروستکەرە.

چەند وێنەیەکی شیعرەکانی دەربارەی باسەکە:

١- از صحبت پاشا بەپرهیز
چون ینبه خشک از آتشی تیز

نزیک بوونەوە لەپاشا وەکو لۆکە بردنە بەردەمی ئاگری تیژە. (مجنون لیلی)

٢- کە سرو از راستی برزد علم را
ببیند از خزان راج غم را

(سەرو لەبەر ئەوەی ڕاست هەڵچووە، تارای خەزان نادا بەسەریا و هەمیشە چوار وەرزە سەوزە (خسرو شیرین)

٣- سایە گزیدە لبی خورشید را
شانە زدە باسری بیدرا

(ڕۆژ گازی لە لێوی سێبەر گرتووە و (با)ش شانە ئەهێنێ بەپرچی شۆڕە (بی)دا. (خسرو و شیرین).

٤- سهی سرواز چمن قامت کشیدە
ز عشق لالە بیر آهی دریدە

(باڵای سەروی ڕاستی ناو چیمەن سەوزە مایەی کراس دڕینی گوڵاڵە سوورەیە). (خسرو شیرین).

سحرگاه چون روان شد جامە جمشید
عروسانە بر آمد جرم خورشد

(بەیانی کە جامی جەمشید ڕووناکی تێ کەوت مانای دنیا وەکو بووکی ئەستێرەی ڕۆژ هاتە دەرێ).

٦- سخن از من افریدە چە فتوەت از مروەت
هنر اشکارا چە طراوەت از جوانی

(قسە لە من دروستکراوە، وەکو جوامێری لە دەروون هونەر لە ئەوە دیارکەوتووە وەکو تەڕ و پاراوی لە جوانی).

١- لە چیرۆکی (مجنون و لیلی)دا کە دێتە سەر گێڕانەوەی چیرۆکەکە وەکو چۆن ئەو چیرۆکە لەناو کوردەواری باوە بەو جۆرە ئەی گێڕێتەوە. لەم چیرۆکە شیعریەدا بەهەناسەیەکی بۆ چڕوکویەوە باسی (عیراق) ئەکات وەکو یەکێ لە نیشتمان ئاوارە بووبێ و تاسەی گەڕانەوەی کەوتبێتە مێشکەوە بەو جۆرە لە عیراق ئەدوێ. ئەوەی ئاشکراو دیارە ئەو عیراقەی ئەوسا ئەو باسی کردووە نە لە بارەی سنوورەوە و نە لە



بارەی نیشتەجێگای ئێستای ئەم وڵاتەوە ئەم عیراقەی ئێستا ناگرێتەوە. تا ماوەیەکیش لەمەوبەر ئەوترا (عیراقی ڕۆم و عیراقی عەجەم) ئەوانەی کە شارەزای تۆپۆگرافی وڵاتەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستن ئاشکرا دەستنیشانی شوێنەکانی (عیراقی ڕۆم و عیراقی عەجەم) ئەکەن کە بەهەردوو بارەکەدا کوردستانی ئێستا ئەگرێتەوە. چونکی ئەگەر باوکی نیزامی لە خەڵکەکانی کوردستانی عیراقی ئێستا بێ یا کوردستانی ئێرانی ئێستا بێ یا لە بەشی سەرووی سنووری ئێستای عیراق لە زەوی (جەزیر و خواروی ئێستای تورکیا)وە ڕەوی کردبێ بۆ (قم) لە نزیک تاران هیچ گێرە و کێشەی ناوێ کە باوکی کورد بووە. چونکە هیچ بیر و ژیرێ ئەوە ناسەلمێنێ ئەگەر باوکی کورد نەبێ لە عیراقەوە ڕەو بکا بۆ قم لەوێوە بۆ گەنجە ئەگەر نزیکییەکی گیانی نەبێ چۆن سەرۆکەکانی (شەدادیەکان) کچی ئەدەنێ و ئەیکەن بەزاوای خۆیان بێجگە لەمەش لە هیچ چیرۆکێکی شیعری نیزامیدا نییە و باوکی کە لە نەتەوەیەکی تر بووبێ. یانی خۆی لە هیچ ڕێکخراوێکیدا پەنجەی ڕانەکێشاوە بۆ دیاریکردنی باوکی بەوەی کە لە نەتەوەیەکی تر بووبێ.

٢- نیزامی خەڵکی (گەنجە)یە، بەڵێ باشە، بەڵام گەنجە زیاتر لە حەوت سەد ساڵ لەمەوبەر پایتەختی کێ بووە؟ بێ گومان گەنجەی ئەوسای نزیک گەنجەی ئێستای ئازربایجانی سۆڤیاتی پایتەختی (شەدادیەکان) بووە.

شەدادیەکان دەوڵەتێکی کوردی بوون دەسەڵات و فەرمانیان چەن جێگایەکی ئەملاو ئەولای تری ئازربایجانی ئێستای گرتبووەوە. ئەو سەردەمە ئەم سنوورە جوگرافیەی کە ئێستا هەیە ئەوسا نەبووە. ئەو سنوورەی کە ئیمڕۆ بۆ چوارچێوەی تێ خزاندنی نەتەوەیەک دیاری ئەکرێ ئەوسا لە گۆڕێ دا نەبووە. یانی ئەگەر بەسنووری قەوارەی دەوڵەت شوێنی دەسەڵاتی شەدادیەکان نیشان بکرایا ئەتوانین بڵێین کە «نیزامی» ئەوسا لە چوارچێوەی دەسەڵاتێکی کوردیدا ژیاوە کە نە ئێران و نە ئازربایجانی ئیمڕۆ خاوەنی ئەو وڵات و مەڵبەندە نەبوون.

٣- بۆ ڕاست چەسپاندنی هەوڵدانەکەمان بەوەی کە نیزامی کورد بووە ناچارین لە هەندێ لکی وا بدوێین کە دژواریەکی تەواوی هەیە بەسەر لێدوانەکەوە. کە ئەویش مەسەلەی (مەزهەب)ە کە ئەو سەردەمەی نیزامی تیا ژیاوە لووتکەی بەربەرەکانی دوو مەزهەبە ئیسلامییەکە بووە کە بریتین لە (سونی و شیعە) ئەوەی ئاشکرایە نیزامی و باوکیشیی سونی مەزهەب بوون. هەندێ سەرچاوە ئەڵێ: باوکی لەبەر ئەوەی سونی بوو بۆیە لە (قوم)ەوە ڕەوی کرد چوو بۆ گەنجە چونکە لە (قوم) ئازار ئەدرا. ئەم بیروڕایە

ئەسەلمێ چونکی لە کاتی بەربەرەکانی کردنی مەزهەبییەتدا ئەگەر باوکی سونی نەبووبێ بنەماڵەیەکی وەکو شەدادیەکان هەروا بەئاسانی ژن و ژنخوازیان لەگەڵ نەئەکرد ئەگەر باوکی نەبووبێ وا بەئاسانی ژنێکی نەئەهێنا کە یەکێ بێ لەسەردارەکانی کورد.

٤- نیزام کە لەپێشەکی (مجنون لیلی)دا لەسەر باسی دایکی ئەڵێ:

گــرمـــادر من رئیـــــسە کـــرد
مـــادر صــفـــتـــانەییش من مـــرد

ئێســتـاش لەناو کـوردەواریدا باوە ئەڵێن: دایک ئەو دایکەیە مـەرگی ڕۆڵەی خـۆی نەبینێ. واتا ئەگەر دایکی من یەکێک بێ لەسەردارەکانی کورد وەکو چۆن لە منالێـما گـۆشی کـردم و بەخـێوی کـردم و گـەرتووی کـردم هەر بەو جـۆرەش بەو ئامـوژگـاری و دڵ بەندی و ئەو دڵە پڕ بەزەییـــیـــەوە لەبەردەمم وا کـــۆچی دوایی کـــرد. لێـــرەدا جـــارێ بەشانازیەوە نیزامی دەری ئەبڕێ کە دایکی کوردە، ناویشی (ڕەئیسە) بووە، وە وەکو لەناو کـوردەواریشـدا باوە مـەرگی ڕۆڵەی خـۆی نەبینێ و پێش مـردنی نیـزامی گـیـانی سپارد بەدروستکەری. ئەمە بوو بەکورتی هەوڵدانێ بۆ ناسینی ئەو شاعیـرە بلیـمەتە گەورەیە کە سەرچاوەی کەرەسەی هەموو جۆرە شیعری هەموو زمانەکانی جیهانە.

***

## زاراوەکان[1] لە زمانی کوردیدا[2]

١٩٥٨

هەرچەندە دوان ئێـسـتـا و لەم کـاتەدا لەم باسـە پەلوپۆی زۆر لێ ئەبێـتـەوە ڕامـان ئەکێشێ بۆ دنیایەکی تر، دنیای مناقەشە و لک لێ بوونەوە بەڵام ناچاری و بەتایبەتی لەم کاتەدا کە نووسینی کوردی و وێژەی کوردی بزووتنەوەیەکی تێ کەوتووە وامان لێ ئەکـات گـوێ نەدەینە ئەو لک لێ کـردنەوانە و کـورتەیەک لەم بارەوە بدوێین. لەوەتی زمانی کوردی بەتایبەتی شێوەی سۆران ئەچێتە سەر کاغەز هێشتا زاراوە چ زانستی چ ئەدەبی چ نووسینی دەقی نەگرتووە و نەبڕاوەتەوە و جێگیر نەبووە. ناڵێم نین کە زمانی کـوردی بزانن، ناشـڵـێم نەبوون، بەڵـێ هەن و بووشن، بەڵام بوون و هەوڵـیـان بۆ ئەوەی دەق بەچەن زاراوەیەک بگرن و ببێـتـە شـتـێکی بڕاوە و لێ نەدوان نەگـەیشـتـۆتە ئەو ڕادەیەی نووسـەری کـورد چاو بکاتەوە، ئەمـەش ناتوانم وای لە قـەڵەم بدەم کـە ئەم

(١) نووسـەر وشـەی (مـصطلحـات)ی عـەرەبی بەکـارهێنا بوو. وامـان بەباش زانی بیکەینە (زاراوەکان).

(٢) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١٣٨٠) ١٩٥٨/٢/٦.



کەموکوڕییـە یەکەندەردو ئەبێ بهاوێژرێتـە سەرشانی زمانزانەکانی کـورد چونکە باری میللەتی کورد خۆی و ئەو کۆسپانەی کە بەر لووتی گرتووە ئەبێ حسابێکی باشی بۆ بکرێ.

دەی کەوابوو نووسەری ئێـستـا و لەمەو دوا چی بکەن و چۆن بنووسن؟ چی بنووسن؟ ئەگـەر هات و نـووسـینێـکیـان نووسی و زاراوەی تێ کـەوت، هەر کـەسـە خـۆی چۆنی دائەنێ وای بنووسێ؟ یا چۆن وتراوە وا بڕوات؟ بۆ نموونە بە ( مناقـشـە) چی بـوترێ، بوترێ (دەمەقاڵی یا مقۆ مقۆ) یا شتێکی تر. جارێ با ئەم دوو وشەیە بگرین (مناقشە و مفاوضە)(دەمەقاڵی و گفتوگۆ) یەکەمیان ئەگەر بڵێین (دەمە قاڵێ) نابێ چونکە مناقشە هیچ شەرت نییە لە ئەنجامی (سوئی تفاهمێکەوە) بێتە گۆڕێ. یا ئەگەر بڵێین مقۆ مقۆ دووبارە هەر بەرامبەری وشەی مناقشە ناوەستێ چونکی کە وترا مناقشە ئەبێ لەسـەر شتێ بێ و ئەنجامێ ببەخشێ. شەرت نییە لە ئەنجامی ڕووداوێکەوە بێ، بۆ گەیشتنە ئەنجامێ ئەکرێ، بەڵام مقۆ مقۆ دوورە لەم ئەنجامەوە چونکی ئەوترێ مقۆ مقۆ داکەوت، بۆچی داکەوت؟ چونکە ڕووداوێکی سەیر ڕووی داوە ئەم و ئەو باسی ئەکەن سا یا پێیـان خۆشە یا ناخۆش. ئیـتر تەنها ڕوودراوەکە باسی ئەکرێ یا ڕووت و هیچ تەعلیـقـێکی لێ نادرێ یا هەر کـەسە بڕیاری خـۆی لەسـەر ئەدا بێ ئەوەی مناقـشـەی لەسەر بکرێ. دووەم (مفاوضـە) شەرتە ئەبێ لەسەر شتێ بکرێ وە ئەوەی تا ئێـسـتـا زانراوە لەسـەر شـتێ ئەکـرێ کـە پەیوەندیەکی بناغـەیی هەبێ بەلای گـەلێکەوە یا دەستەیەکەوە یا چەن کەسێکەوە بۆ هێنانە دی چەن (مهام)ێک یا سیاسی یا ئابووری یا سەقافی. بەڵام من و تۆ و ئەم و ئەو ئەتوانن گفتۆگۆ بکەن.

گـفـتـۆگـۆیەکی ڕووت و بێ ئامـانج یا بۆ ڕابواردن یا بۆ کـات کـوشتن یا ئەگـەر زۆر قـووڵی کـەینەوە بۆ لە یەک گـەیشتن خۆ ئەگـەر هات و وتمان (لێـدوان) ئەوە هەر زیاتر دوور ئەکـەوینەوە لەو مـەبەسـتـانەی وشـەی مفـاوضـە پێـویسـتـێـتی. چونکە لێـدوان بۆ ڕوونکـردنەوەی شـتی زیاتر ڕاسـتـتـرە وەی لەوەی بیبـەی بۆ ئەوەی بەرامبـەر وشـەی (مفاوضە)ی دابنێیت. لەم بابەتەوە بیگرە تا ئەو پەڕی ئەو زاراوانەی پێویستیە کە بۆ نووسـینی کـوردی ئەگـەر هەبێ و ڕاست و کـوتومت بەرامبـەرەکـەی لە زمـانی کـوردیدا هێـجگار کەمن وە ئەوانی تری وەکو ئەو دوو وشەیەی بۆ نموونە هێنامەوە هەر بەو جۆرە ئەمـانـخـاتە لێـدوان و لـێکۆڵـینەوەیەکی دوور و درێژەوە. جـا ئەگـەر هات و لە جـیـاتی زاراوەی (الخـالد) وترا زیندوو نەک نەمر لام وابێ نابێ وەک وشـەیەکی نەبڕاوە و جێ نەگر بەرامبەر وشەی (الخالد) نووسەران و خوێندەواران ڕابچڵەکێنێ و بەهەڵەی بزانن،

بۆچی؟ با ئێمە بێین بگەڕێین بۆ ئەسڵی وشەی (الخالد) لە چییەوە هاتووە؟ ئاشکرایە کە لە (خلود)ەوە هاتووە. خلودیش زیندوو بوونەوەیە نەک بەزیندوێتی مانەوە وەک هەندێ ئەڵێن. بۆ ئەوەی باشتر بچینە کۆڕی لێکۆڵینەوەکەوە (ویوم یبعث حیا) لەپێشا (یبعث) ئنجا (حیا). ئەگەر زیندووکردنەوەبێ وەک ئەڵێن ئەی (حي) چی لێ بکەین؟ با وردتر بۆی بڕۆین، (حي) بەرامبەرەکەی لە عەرەبیدا (قائم) لە کوردیدا ڕاوەستاوە، ماوە، ئەمە ئەگەر (ڕووت) وەربگرین خۆ ئەگەر (حي) وەکو ئەڵێن بەمانای زیندووی بەجوڵە و بەحەرەکە بێ ئەی چی لەم ئایەتە بکەین (بل أحیاء عند ربهم یرزقون). کە ئەم ئایەتە لەگەڵ مردووەکانێتی. ئەگەر هات و بەرامبەر خالد وتمان نەمر هەمیسان ئەبێ بڕۆین بۆ وردکردنەوەی وشەی (نەمر) نەمر، نەمردوو، نە، لا، مردوو، میت، کە ئەکاتە (لا یموت) کەواتە نەمر زیاتر (لایموت) ئەگەیەنێ وەی لەوەی (الخالد) بگەیێنێ. لێرەشا لەوە نادوێین و ناشمەوێ هێجگاری بیبڕمەوە کە زیندوو لە نەمر بەرامبەر (الخالد) ڕاستترە. بەڵام ئەوەمان ئەداتە دەست کە هەڵە نییە بڵێم زیندوو ئەشگونجێ بڵێم نەمر جا ئیتر بۆچی سەرپشک نەبم کە کامیان لە جیاتی (الخالد) بەکار بهێنم. ئەگەڕێمەوە بۆ ئەسڵی باسەکە و ئەڵێم لەسەر بناغەی ئەم لێدوانە دەرئەکەوێ کە ئەبێ چارەیەک بدۆزرێتەوە بۆ زاراوە (مصطلحات).

من ئەڵێم بۆ ئێستای نووسینی کوردی پێشنیارەکەی کاک (ژیر) بەجێ و ڕاستە بەمەرجێ ئەو کۆبوونەوەیەی کە ئەو داوای کردووە بۆ دانانی (مجمعێکی لغوي) یەکێ لە باسەکەی زاراوەبێ. بەڵام ئایا ئەو خەڵکەی نووسینیان مەبەستە بەو کەسانە ڕازین کە ئەو هەڵی بژاردوون؟ ئەتوانن بەم زووانە کۆبینەوە؟ تۆزێ کاتیانی بۆ تەرخان بکەن؟ لەپاشا ئەو کۆبوونەوەیە خۆی بەشێوەی سۆرانەوە خەریک بکات ئەی بۆ شێوەکانی تری زمانەکەمان چی بکەین؟ چی بکەین بۆ شێوەی بادینان و لوڕی! ئایا ئەو دوو شێوەیە شێوەی سۆران بەپێشکەوتووتر ئەزانن لە خۆیان و گوێی بۆ ڕایەڵ ئەکەن؟

***

# مەم و زین[1]

**١٩٥٨**

«بەبۆنەی پیشاندانی ئەم چیرۆکەوە لەسەر شانۆی قوتابیانی ناوەندی»

ئەگەر نەتەوەکان شانازی بەڕووداوە دڵدارییە خاوێنەکانیانەوە بکەن وەکو عەرەب

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١٣٨١) ١٩٥٨/٢/١٣.



بە(قیس و لەیلا)وە و ئیتالیا بە(ڕۆمیۆ و جولێت)ەوە نەتەوەی کوردیش هەقی خۆیەتی شانازی بەڕابوردوو و کارەساتە دڵدارییە بەفەڕ و نرخەکەیەوە بکات و مەلحەمەی مەم و زین بکات بەدەزگای لێکۆڵینەوە و لێ وردبوونەوە و ڕابوردووی. بۆیە دەستەی قوتابیانی خوێندنگای ناوەندی شەو خەریکی سازکردنی ئەم چیرۆکەن بۆ پیشاندانی لەسەر شانۆی خوێندنگای کوڕان لەم چەن هەفتەی دواییدا. هەر چەندە چیرۆکی مەم و زین شاعیری بزووتنەوەی نیشتمانی کورد (پیرەمێرد) گەیاندوویەتیە سەر کاغەز وە دەستێکی هەبووە بەناسینی (ئەحمەدی خانی) مەزندا بە و خەڵکە هەروەها دەستەیەک لەلاوە نیشتمانپەروەرەکان لە ساڵی **١٩٣٩**دا چیرۆکێکی مەم و زینیان پیشانی ئەو خەڵکە دا لە شاری سلێمانی بەنگینە وێنەی برادەری ڕاستی و خۆبەختی و خوێشایەتی و لەخۆ بوردن بۆ هەوڵ و بیری ڕێگا و نەتەوە مەم:

مەم شمع دگر ژ بو خو دەمساز
کەی هم نشینی و همدم و همراز
هر چەند، بەسوهتنی وەکی من
امانە بەگوهنی وەکی من

مەم مۆمی کردبووە هاودەم و هاونشین و هاوڕاز لە زیندانە تەنهاییەکەیدا لە کاتێکا سوژنی ناکامی ورد ورد بەدڵە پڕ ئاواتە ناکامیەکەیدا ئەچووە خوارێ ڕووی ئەکردە مۆم و پێی ئەوت: هەرچەندە لە سووتاندندا لەمن ئەچی بەڵام لە دواندندا لەمن ناچی، تۆ بەتەنها ئەسوتێیت و ئەبڕێیتەوە بەڵام من ئەسووتێم و نامرم، گڕم تێبەر ئەبێ کەچی ئاوی ئاوات و هیوا جار جارێ گڕەکە ئەکوژێنێتەوە، سەرلەنوێ هەڵئەگیرسێمەوە دووبارە ئەکوژێمەوە.

زین، لە کاتێکا دڵی وەکو (کەباب) وەک ئەو دڵۆپانەی ئەتکێتە سەر ئاگر ئەبێتە هۆی ئەوەی باشتر بیبرژێنێ ئەویش ئەو فرمێسکانەی کە لە چاوی ئەتکا گڕی تێبەر ئەدا هەر لەو کاتەشا زنجیری ناشادی پێچ پێچ ئاڵایە جەستەی بەو جۆرە ئەو دوو دڵە بەتەنیشت یەکەوە خرانە ژێر گڵ بەڵام کام گڵ، گڵی نیشتمانی پیرۆز، کام نیشتمان؟ کوردستانی خۆشەویست.

***

# گفتوگۆیەکی ئەدەبی و وەڵامەکانی دیلان[1]

بەبڕوای ئێوە ئەدەبی کوردی پێ بەپێی قۆناغی شۆڕشگێڕانەی خەباتی گەلەکەمان هەنگاوی پێشکەوتووانەی ناوەوە و دەورێکی کاریگەری گێڕاوە یان نا ء. وەڵام: لام وایە کە ئەڵێین ئەدەبی کوردی مەبەستتان لە شیعری کوردییە چونکە زۆربەی بەرهەمی ئەدەبی کورد بریتییە لە شیعر، لاشم وایە کە ئەڵێین خەباتی گەلەکەمان مەبەستتان بزووتنەوەی نەتەوەی ئازادکەری گەلی کوردە ئەو ساڵانە ئەگەیەنێ کە ئەکەوێتە پێش شۆڕشی گەورەی ئۆکتۆبەر و شان بەشانی ئەو شۆڕشە ئەڕوا ئەو ماوەیەی کە ئەکەوێتە ساڵەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم هەر چەندە پڕە لە هەستان و بزووتنەوە بۆ دەرخستنی شەخسیەتی نەتەوەی کورد، بەڵام بەداخەوە زۆربەی ئەو شیعرانەی کە شاعیرەکانی ئەو سەردەمە گوتوویانە و ئەو هاوار و بانگانەی کە گەرووی دڵسۆزانەی ئەوانەوە هاتۆتە دەرێ دووچاری لەناوچوون بوون. هۆی ئەو لەناوچوونەش چیرۆکێکی کورتە کە بەهێرشی لەشکری دەوڵەتی عوسمانی دەست پێ ئەکا بۆ سەر شار و دێهاتەکانی کوردستان سا چی سووتا سووتا و چی دڕێنرا و چی لەناوچوو لە نووسین و شیعر و ڕێکخراو دوایی دێت. ئەو هێرشە سەربازیەی کە هێزەکانی عوسمانی کردیە سەر ئەم وڵاتە و دەسەڵاتی بابانەکانی پێ لەنێو برا هەروەهاش ئەو وشە ڕووناکانەی کە لە زمان و قەڵەمی ئەو شاعیرانەوە ئەهاتە دەرێ زۆربەی سووتێنرا، ئەگینا ئێستا لە وەڵامی ئەو پرسیارەی سەرەوەدا کۆمەڵە ڕێکخراو و هۆنراوەیەکی بەنرخ ئەخرایە بەردەم کە پێی دەربخرایە شیعری کوردی پێ بەپێی قۆناغی شۆڕشگێڕانەی خەباتی گەلەکەمان هەنگاوی ناوەوە و دەورێکی کاریگەری هەبووە. لەو پێناوەدا لێرەدا بۆ نموونە ئەم چەند شیعرەی شاعیری نەمر (سالم) ئەنووسین دەربارەی ئەو هێرشەی لەسەرەوە باس کرا؟

حاکمە ڕۆمی لەسەر تەختی سولەیمانی درێغ
کەوتە دەستی دێوی دوون میهری سولەیمان الامان
بێ زوبان کووکوو زەنان هەر خانەدان تێ دەفکرن
عەنکەبووت خواجە نشینە جفتە جوغد و دیدەبان
مەردی مەیدان هاتە جەولان باز لە دەنگی تەپڵ باز
... هتد

(١) گۆڤاری ڕزگاری ژمارە (٩) ساڵی یەکەم یەک شەممە ٢١ی ئەیلولی ١٩٦٩.



ئەمە پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەر لەگەڵ شۆڕشی ئۆکتۆبەریشا شیعری کوردی پیرەمێرد بەو هەموو گڕ و تین و سەودای نەتەوەییییەوە گۆرانی بۆ شەهیدەکانی شۆڕشەکانی کوردستانی سەرەوە ئەڵێ و ئەی گەیەنێتە گوێچکەی کوردەکانی کوردستانی خواروو. شیعری پیرەمێرد نەک تەنها شان بەشانی قۆناغی شۆڕشگێڕانەی گەلەکەمان هەنگاوی ناوە بەڵکو شیعری کوردی لە ناوچییییەوە گواستۆتەوە بۆ جیهانی و نەک تەنها دەورێکی کاریگەری بووە بەڵکو هاندەرێک بووە بۆ خۆ بەختکردن و بۆ پێشەوەچوونی خەبات کردن بۆ وێنە ئەم چەند شیعرەی خوارەوە ئەنووسین:

(بۆ جەژنی و شاییییە جلی سووریان ئەوێ منداڵ
ئەم جەژنە خوێنی کوردە فەلەک کردیە بەرگی ئاڵ
قەی ناکا، ئەو لەپێشەوە خوێنی (عەلی) ڕژان
دیسان بەخوێنی ئێمە ڕۆژووەکەی شکان
دڵۆپێکی خوێن لە لەشی شێری شەرزەوە
وەک تەرزە دێتە خوارەوە لەو شوێنە بەرزەوە
چەن بەرزیە لە بەندەنی بەرزی نزارەوە
هەڵمەت بەری بەلاوکی کوردی و قەتارەوە)

ئەگەر بێ و قووڵ بچینە ناو وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەی سەرەوە چەن لاپەڕەیەکی درێژی ئەوێ بۆ وەڵامدانەوە و ئەبێ لە هەموو ڕوویەکی باسەکەوە بدوێین ئەمەش لەم ماوەیەدا نابێت.

بەلای تۆوە وەکو شاعیرێک پەیامی شیعر چییە؟ لە خەباتی گەلا؟ وە ئاخۆ شیعری کوردی بەم ئەرکە هەڵساوە؟

وەڵام: بەلای منەوە پەیامی شیعر یا ڕاستتر ڕێڕەوی شیعر ئەبێ بریتی بێ لە ئاوێنەیەک بۆ دەرخستنی ئازارەکانی گەل نیشاندانی دەردەسەریەکانی، ئاشکرا کردنی دوژمنەکانی، هەڵسەنگاندنی دۆستەکانی، ئەبێ ئاوێنەیەک بێ بۆ هاندان بۆ خەباتکردن بۆ بەگژ داگیرکەرا چوون، بۆ دۆستایەتی پتەوکردن لە نیوان گەلانی جیهانا بەمەرجێ ڕێزی نەتەوەکانی تیابێ، ئەبێ بۆ کورد بڵێ، یانی بۆ زۆربەی نەتەوەی کورد بڵێ، کە بریتییە لە چینە ڕەنجدەرەکان، ئەوانەی قازانجیان هەیە لە خەباتی گەلەکەمان و بۆ بەدەستهێنانی ئەو قازانجە خەبات ئەکەن ئەبێ شیعر بۆ گەل بڵێ و بۆ پێشەوەچوونی. بەڵێ شیعری کوردی بەو ئەرکە هەستاوە. شاعیری نەتەوەپەرستی کورد بێکەس ئەڵێ:

دۆستی کورد و عەرەب زۆر کۆنە تەئریخ شاهیدە
ناحەزی ڕووڕەش لەداخا با یەخەی خۆی دادڕێ
نێر و مێ هەردوو بەجووتە بۆ وەتەن هەوڵێ ئەدەن
دوورە دەرچوونی لە دیلی مەل بەباڵی نافڕێ
ئەم وڵاتە خۆشەویستەی خاکی گوڵگون بوو بەخوێن
تا هەقی دەستگیر نەبێ ئەم خوێنە دەست هەڵناگرێ

لە قۆناغی ئەدەبی ئێستاماندا شیعری کوردی لە چ پلەیەکدا ئەبینن؟

وەڵام: لە قۆناغی ئەدەبی ئێستاماندا ئەگەر مەبەست لە ئێستەی شیعری کوردییە ئەوا باری ئێستای ڕووە و واقعیەت ئەڕوا لە ڕووی ناوەڕۆکەوە. بەڵام لەبارەی هونەری شیعریی و داڕشتنەوە ئەو هێز و پاراوییەی کە لە شیعری شاعیرە کلاسیکیەکاندا ئەبینرا بەو جۆرە لە مانا نابینرێ. خۆ ئەگەر مەبەستیشت بەتێکڕایی لە شیعری کوردییە پاش شەڕی جیهانی دووەم دوو بەشە، بەشێکیان لەسەر ڕێڕەوی هونەر بۆ هونەر ئەڕوات سا ئیتر ئەمە ئەو شاعیرانە خۆیان ئەو بڕوایەیان هەیە یا گوزەرانی کوردستانی سیاسی و کۆمەڵایەتی خستوویییە ئەو قاڵبەوە وا بەو جۆرە ئەڕوات ئەمە لێی نادوێین. بەشی دووەم کە لای خەڵکی خەباتکەر و لەگەڵ کاروانی بۆ پێشەوە ڕۆیشتووی گەلانی جیهاندا سەرژمێر ئەکرێ و بایەخی ئەدرێتێ و ژیانیشی هەر بۆ ئەو جۆرە شیعرانەیە. ئەمە توانیویەتی لە بڵاوکردنەوەی بیری ئاشتیخوازانەی دوای ساڵانی ١٩٥٠و بەرەو ژوور و لە هاندانی گیانی نیشتمانپەروەری و شۆڕشگێڕانە لە نێوان کۆمەڵانی خەڵکی کوردستاندا ئەڵێین توانیویەتی بەرهەمێکی باش بێت. شیعری گۆران پاش ١٩٥٠ ئەو ئاراستەکردنەی وەرگرتووە کە ئەدەبی کوردی بەرەو ئاراستەکردنێکی مرۆڤپەروەرانە بەرێت.

ئێستا و چەن ساڵێکە بزووتنەوەیەکی ئەدەبی لە کوردستاندا هاتۆتە گۆڕێ کە ئەگەر هان بدرێ، پشتی بگیرێ بەمادە و بەهەڵسەنگاندن ڕێزی لێ بگیرێ ئەوەی لێ ڕا ئەبینرێ بۆ پاشەڕۆژ بتوانرێ بەرهەمی بەنرخ و بەکەڵک پێشکەش بەخوێندەوارانی زمانی کوردی بکات.

– لەوەتەی دەستتان داوەتە نووسین چەن بەرهەمی ئەدەبیتان بووە؟ چەندەی لێ بڵاوکراوەتەوە و چەند ماوە؟

– لە ساڵی ١٩٤٩وە دەستم کردووە بەشیعر نووسین. لەپاش پەنجاوە کەوتۆتە سەر ڕووپەری ڕۆژنامەی ژین. لە ساڵی ١٩٥٤ دوو نامیلکەم چاپ کرد یەکێکیان



چیرۆکێکی شیعری بوو لەژێر ناوی (شەڕ و ئاشتی)دا ئەوی تریان (کونەپەپوی شەڕ) ئەوەی کە لە نەورۆزی ١٩٥٤دا خوێنرایەوە زۆربەی نووسینەکانم لە ڕۆژنامەی (ژین)دا بڵاوکراوەتەوە هەر چەندە لە ڕۆژنامەکانی تریشدا هەندێکی لێ بڵاوکراوەتەوە. لە ساڵی ١٩٥٧دا کتێبخانەی گەلاوێژ کۆمەڵە شیعرێکی چاپ کرد و لەژێر ناوی (شێخ مەحموودی زیندوو)دا بڵاوکرایەوە. لە ١٩٦٩دا زۆربەی شیعرەکانم بەناوی (دیوانی دیلان)وە بڵاوکردەوە ئێستا چەن پارچە شیعرێکم ماوە کە هێشتا بڵاو نەکراوەتەوە لە سووچی وا سەیرایە لە چەن گۆڤار و ڕۆژنامەیەکا کە ئەگەر چاپ بکرێ بەتازە ئەژمێررێ. نیازم وایە ئەگەر توانام بوو چاپی بکەم.

١٩٦٩

***

# نحن بحاجة الى رابطة أدبية(١)

إن موضوع اجتماع الكتاب والشعراء الاكراد لبحث تأليف رابطة جامعة لهم يأخذ المكانة الاولى في شؤوننا الفكرية اليوم، فالحركة الانتعاشية الادبية المتصاعدة، وتقبل جمهور الشعراء والطبقة المثقفة لها العوامل المساعدة لنضج هذه الفكرة تعطي نتيجة ايجابية لنجاحها. فالفكرة بحد ذاتها ليست وليدة الصدفة، ولا عارضة، بل لها جذور ومحاولات سابقة عديدة ففي اوائل سنة ١٩٥٤ عندما طرحت الفكرة امام فريق من الكتاب والشعراء الأكراد في مدينة السليمانية قبلت بإرتياح وحماس بالغين، وإتخذ المجتمعون قرارات بهذا الصدد كانت بمثابة الخطوة الاولى للبدء بالعمل ومن جملة قراراتهم الاجتماعات الدورية والقيام بالاتصالات الأدبية على مستوى عالٍ من الكتاب والشعراء الأكراد المعروفين والبارزين. واصدار ملحق لجريدة (ژين) تعكس المهمات والاهداف المتفق عليها. وتبرز على صفحاته الوحدة الحركية للادب الكردي. وتكررت المحاولات في اواسط سنة ١٩٥٦ ولكن الظروف جمدت الفكرة وهي لاتزال في طور الجنين.

ان مسألة تكوين رابطة بإسم (رابطة الكتاب والشعراء الاكراد) لها اهميتها وفوائدها فهي أي المسألة: تنظم الفعاليات الادبية على اختلاف مذاهبها التعبيرية و مقاييسها الموضوعية والذاتية. وتطرح المهاترات اللاإنشائية جانباً والتي ظهرت بوادرها واضحة في صفوف الحركة الادبية والتي نحن الآن في غنى عنها وتضع حداً للبعثرة غير المستحبة للنشاط الادبي وتوحد الاتجاهات والاهداف الفكرية الصالحة

(١) گۆڤاری (شەفەق) بەشی عەرەبی ژمارە (٦.٥) مایس و حوزەیران ساڵی ١٩٥٨.

لخدمة الادب الكردي. وتبعثه وتطوره ليأخذ المكانة اللائقة به ضمن أسرة الآداب العالمية الحية.

هذا من جهة، ومن جهة اخرى تخلق مجالاً للرابطة نفسها كي تقوم بدورها التأريخي في خدمة المجتمع كبقية الهيئات والمنظمات الاجتماعية العاملة كل ضمن مسؤولياتها واطارها النظري والعملي. وتفتح آفاقاً جديدة لازدياد الاحترام المتبادل مع الشعب العربي الصديق وهيئاته الادبية وتقوية الروابط الاخوية وبث روح المودة والتفاهم وذلك عن طريق ايجاد فرصة لإظهار مأثرة من مآثر هذا الشعب الطامح الى البقاء.

اذن فالمعضلة المطروحة بصورة موجزة وعاجلة تتطلب درساً وعملاً سريعاً مثمراً للاتيان بالفكرة الى حيز الوجود كما وأني اعتقد بأن هذا الاقتراح يتلقى الترحيب من العناصر التي تكافح في سبيل خدمة الادب الكردي والمثقفين الذين يريدون العمل من أجل هذا الشعب.

مايس ١٩٥٨

***

## نەورۆزی ساڵی ١٩٥٤[١]

لە زستانێکی تووشەوە بۆ بەهارێکی ڕازاوە لە کرێوە و بەستەڵەکەوە بۆ شنەی شەماڵ و تارای گۆڵاڵە، لە تەم و هەوری لووتکە داپۆشیوەوە بۆ بریقە و شاخی ڕەنگاوڕەنگ، لە مەل و مێروو، لە، کون خزانەوە بۆ جووڵە و خوێندن لەسەر چڵ و گوڵە کراوەکان، لە ئاسمانێکی ئاڵۆزی بێ هەتاوەوە بۆ چریسکەی شەونم و گزنگی بەیانیان لە زوقم و چلوورەوە بۆ هاژەی چاوە و هەموو شتێکی ژیاوە، ئەمە سروشت ئەمە وەک ئەڵێن لە گریانی زستانەوە بۆ زەردەخەنەی بەهار. ئەی ئەگەر لایەنی تر بگرین و بۆ ئەو شتە بڕوانین کە بێ ئەو ئەمانە بێ فەڕن، بێ بۆنن، بێ ئارایشتن، بێ شەفاف و بێ ڕەنگن ئەگەر سەرنجێ بدەینە گوزەرانی کۆمەڵایەتی ئەو کۆمەڵاتیەی کە چەند پشتێ لەمەوبەر بەهاری کرد بە دوو بەهار، چۆن؟! لە زستانەوە بۆ بەهار، بەهارێکی تریش کە نەتەوەی کوردی ژێر پێێکی زۆرداری ژێر قاچی زوڵم، ژێر زاری ماری (ئەژدەهاک- زوحاک) ڕاپەڕیو، کاوەی ڕۆڵە کوژراوی ئاسنگەری جەرگ سووتاوی پێشکەوتوو ئەو دڵۆپە خوێنانەی کە سەر شانی زوحاکیان ئەهەنوو، بوو بەدێڕ و نووسی: (خوێنخۆر ئا ئەمە

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١١٩٢) ١٩٥٤/٣/٢٥.



دواییت). بەم ڕەنگە تۆڵەی مێشکە هاڕاوەکانیان کردەوە. ئەمە نەورۆزی چەند پشتێ لەمەوبەر، بەڵام ئیمڕۆ، ئیمڕۆ بەهار یەک بەهاربوو، چونکی لە برسێتیەوە بۆ برسێتی، لە نەزانیەوە بۆ نەزانی، لە نەخۆشیەوە بۆ نەخۆشی، لە زۆرداریەوە بۆ زۆرداری، لە تۆقاندنەوە بۆ تۆقاندن، لەژێر دەستیەوە بۆ ژێر دەستی. بەکورتی لە هەموو ئەو نالەباریانەوە کە نەتەوەی کوردی گەمارۆداوە بۆ هەموو شتێکی هەروەک خۆی، هەموو شتێ هەروەک خۆی ماوەتەوە، جگە لەوەی شتێ لە هەمووان زیاتر و بەهەڵپەتر ڕووی لە نیشتمان و نەتەوەی ئێمە کردووە کە ئەویش مەترسی شەڕە. بەڵێ نەورۆز نەک بکرێت بە دوو نەورۆز، نەورۆز نەک ئەبێ ببێ بە دوو نەورۆز پێویستە نەورڕۆز دوولابێتەوە لایەکی نەورۆز و بەهارە، لایەکەی تری نەورۆز و ئاشتی. چۆن ئەگەر بڵێین گوڵ کرایەوە، مەل لەسەرداره، ئاسمان شینە، هەموو شت پێ ئەکەنێ ئەگەر شەڕ ڕووی تێ کردن، ئەسووتێن، ڕەش دائەگیرسێن، هەڵئەپڕووزێن، ڕۆئەچن، وە ئەو دوو بەهارەی کە ئێمە بەتەمایین ئەبێتە دوو (زستان). کەوابوو پەرۆشەکانی پەڕەی گوڵ و شەونم و ئاوازی سیحراوی سەودای نیشتمان و نەتەوە دڵسووتاوەکانی کۆرپە و ساوا ئەبێ هەوڵ و تەقەلای هەردوو نەورۆزەکەیان بێت بۆ هەردوو نەورۆزەکە بەکوڵ و جۆش بن.

***

## شاعیری گەورە «نالی»[١]

نالی شاعیری گەورە یەکێکە لە کەڵە شاعیرەکانی دەوروبەری گوڵە گەورە پشکوتووەکانی باخچەی فراوانی شیعری بناغەیی زمانی کوردی، زمان فراوانی، زانیاری، ئاگا لێبوون لە هەموو جۆرە بەرواردێکی (علومی فیقهی) دەزگای خوێندەواری نزیک دوو سەد ساڵێ لەمەو پێشی کوردستان وە بەتایبەتی ماوەی دەسەڵاتی حوکمڕانی نەتەوەی کورد بەسەرۆکایەتی بابانەکان کە وەکو ئاشکرا و دیارە دەسەڵاتێکی گەورەی نەتەوایەتی هەبووە.

لە هەموو کونج و کەنارێکی دێهاتە گەورەکانی ئەم ناوچەیەدا (مزگەوت) پایەی خوێندەواری، زانیاری، ئاگا لێ بوون و چوونە ناو دۆزینەوەی فەرهەنگی هەموو جۆرە شارستانیەتێک بووە لەم دەسەڵاتەدا، لەم ناوچەیەدا شاعیرە کەڵەکان هەڵکەوتوون و نالی-یش یەکێکە لەوان هەندێ کەس لە کۆنەوە لەو بڕوایەدان کە (مەلا خدر) نالی بووە. هەندێکی تر لەو بڕوایەدان کە (ناڵی) بووە.

(١) ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارە (٨٣١) ١٩٨٦/٣/١٤.

یەکەمیان: (نالی) بەنازناوی (نالین)(نالیدەن) لە زبانی فارسیدا، دووەمیان: (نالّی)(نالّین) لە زمانی کوردیدا بەڵام ئەوەی ئاشکراو دیارە کە خوێندەواری و خوێندنگای ئەوسا، کە خوێندنگە بریتی بووە لە (مزگەوت) و زیاتر بناغەی خوێندنگە بەفارسی دەستی پێ کردووە بەتەنیشت خەتمی قورئان و صەرف و نەحوی زبانی عەرەبییەوە لەپاشا چوونە ناو خوێندنی (بۆستان و گولّستان)ی شێخی سەعدی کە بەزبانی فارسی بووە. دەسەڵاتی خوێندەواری زیاتر بەزبانی فارسی دەستی پێ کردووە لەبەر ئەوەی خوێندەوارەکانیش شیعر دۆست بوون و لە مەجالیسی شیعری شارەکاندا بەشداریان کردووە و دانیشتنیان زیاتر بەشیعر و ئەدەبیاتی بەرزی فارسییەوە بردۆتە سەر لەبەر ئەوە ئاشکرا بووە هەرکەسێ خۆی بەخوێندەوار بزانیایە ئەبوو چەند شیعرێکی شاعیرە بەرزەکانی فارسییان لەبەر بوایە وەک (سەعدی، حافز، جامی و نیزامی... هتد) بۆیە شاعیری گەورەمان نازناوی (نالی) بەخۆیەوە ناوە نەک (نالّی). کە زیاتر (نالی) فارسی ئامێزە و (نالّی)یش کە کوردی ئامێزە. ئەم باسەش پێویست بوو بۆ ڕوونکردنەوەی لایەکی شارەزایەتی لەم شاعیرە گەورەیەمان. دێینە سەر خاڵێکی تر لە خاڵەکانی دەوروبەری دەرکەوتن و پێشکەوتن و ئاشکرا بوون و جێگاگرتن و بڵاوبوونەوەی گەورەیی شارەزایی نالی لە کوردستاندا. کە ئەویش یاری کردنە بەجوانیەکانی خاڵەکانی شیعر وتن: مەلەکردنە لە دەریای بێ پایانی (تعبیر المعاني الکلامیة، الادراج الشعري، الخصائص الشعرية، في الشعر المعاصر) وەکو (موحەسەناتی لفظی، بەدیع، بەیان، لەف و نەشری المشوش، لەف و نەشری مورەتەب، الکلام المنمق). کە ئەمانە هەمووی یەکێکن لە خوێندن و دەست پێکردنی ڕەوعەتی زبانی عەرەبی بەتەنیشت خوێندنە ئایینیەکانەوە کە لە مزگەوتەکاندا ئەخوێندرا. نالی-یش یەکێک بووە لەو مەلایانەی یاخود لەو مامۆستایانەی کە مەلەی لەم دەریا فراوانەدا کردووە. ئەگێڕنەوە ئەڵێن: لەبەر گەورەیی زانیاری نالی، دەسەڵاتی بەهێزی شیعری نالی خوالێخۆشبوو ئیبراهیم پاشای بابان ئێجگار خۆشی ویستووە بەجۆرێ فراوینی نەدەکرد بەبێ نالی ئەگەر نالی لە سلێمانیدا ببوایە کە ئەمەش پلەیەکی بەرزی ڕێز لێگرتنە لە گەورەیی و ڕێزی شیعری نالی لای پاشای بابان. لایەکی تری گەورەی نیشتمانپەروەری و نەتەوەپەرستی نالی ئەوەیە کە زانی عوسمانیەکان بەڕاستی ئەیانەوێ دەسەڵاتی نەتەوەکە لەم ناوچەیەدا ببڕن و حکومەتی بابان سەرەو ژێر بکەن بەهێرشی گەورە بۆ سەریان ناچار سولەیمانی بەجێهێشت و ڕووی کردە شام و لەوێش ئارامی نەگرت خۆی گەیاندە مەجلیسی ئەحمەد پاشای بابان پاش ئەوەی بەدوورخراوەیی لە ئەستەموڵ دانرا. ئەگێڕنەوە ئەڵێن: کە ئەحمەد پاشای بابان لە



ئەستەموڵ دانیشتنی ڕۆژانەی لەگەڵ نالیدا بووە و بێ ئەو نەیتوانیوە ماوەیەک بەرێتە سەر، تەنانەت ڕۆژێ لە دانیشتنێکی گەورەدا ئەحمەد پاشا کەسێکی خەڵکی سلێمانی لەوێ ئەبێ و خۆی هەڵئەکێشێ بەوەی کە تەزبیحەکەی دەستی کارەبایە و تەقە تەقی پێ ئەکا و هەڵی ئەخرنگێنێ بەشێوەیەک کە ئەحمەد پاشای پێ ناڕەحەت ئەبێ، نالی ڕووی تێ ئەکا بەم شیعرە پێی ئەڵێ:

ئەگەرچی مۆمی دەستت کارەبایە
بەڵام تەرکی بکە ئەم کارە بایە

مانای: مامە خدر ئەگەرچی چراکەی دەستت کارەبایە. بەڵام تکایە وازی لێ بهێنە و ئەم ئیشەی تۆ دەیکەی هەر بایە. جگە لەوەی کە باس کرا لە وردی مەعنا و قووڵیدا لەگەڵ یەکخستنی دوو ڕووداودا نالی لە شیعردا مامۆستایەکی بێ هاوتایە ناچارین بۆ ئەم مەبەستە ئەم چەند شیعرە بە نموونە بێنینەوە:

دڵ سیاسەنگ نەبێ مائلی خاکی وەتەنە
خاڵی لەعلی حەبەشە، ساکنی بەردی یەمەنە

هەتا دەڵێ:

دڵی نالی کە ئەنیسی قەرەداغە ئێستەیش
داغی سەرچاوە و دێوانەی دار و دەوەنە

ئەگەر دڵ ڕەش نەبووبێ، ڕەق نەبووبێ، بەبەردێکی سووتاو، نەبووبێ بەبەردێکی ڕەش هەڵگیرسا و، نەبووبێ بەپارچەیەک لە فڕێ دراوێکی بێ جووڵە، هەتا هەتایە هەر خۆشەویستی نیشتمانی لە دڵ دایە. هەتا هەتایە بەدوای جێگەی لە دایک بوونەکەیدا ئەناڵێنێ. وەکو خاڵێ لەسەر لەعلی حەبەشە، چۆن لەعلی حەبەش لە خوێنی ڕژاو و ئاڵتره لەیاقووتی ناو مەرجانەکان سوورترە لە لێوی گوڵێکی سووری بەهار ڕەونەقدارترە، ئەگەر دڵ ڕەش هەڵنەگیرسابێ، ئەگەر دڵ ڕەش نەبووبێ بەرامبەر بەنیشتمان، هەر ئارەزووی خاکی وەتەن ئەکا. لەعلی حەبەشی چۆن بەتایبەت ئەهێنراو ئەکرا بەنەخش بەسەر بوردوی یەمەنەوە (کە پارچە قوماشێکی نایاب و جوان و ڕەونەقدار و سووری لە یەمەن دروستکراو بوو کە یەکێک بچوایە بۆ حەج بەدیاری ئەی هێنا بۆ خۆشەویستان) ئەگەر دڵ سیاسەنگ نەبێ مائلی خاکی وەتەنە وەکو چۆن خاڵی ڕەشی سەر لەعلی حەبەشی ئەنووسێنرێ بەپارچەیەک قوماشی یەمەنەوە سەرچاوەی قەرەداغ داخێکە بەدڵی نالییەوە دێوانەش ئیشارەتە بۆ ئاوی چەمی دێوانە کە ئەڕژێتە سیروانەوە لەخوار دەربەندیخان. هەر چەندە ماوەیەکی دوور و درێژە چ بەنووسین چ

بەموحازەرە وتنەوە ئەم قەسیدەیەی نالی هەر لە موعەمادا مابووە و تەنانەت شارەزاکانی شیعری نالی کەوتبوونە باس و لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ بەتایبەتی دەرهەق بەشیعری یەکەمی قەسیدەکە بێ ئەوەی ئەوە لێک بدەنەوە کە ئەخیر شیعری قەسیدەکە باسی چەمی دێوانە و چەند دێیەکی ناوچەی قەرەداغ ئەکا. بۆ زیاتر چوونە ناو یەکالآ کردنەوەی شیعرەکانی ئەم شاعیرە گەورەیە پێویستە چاو بگێڕین بەناو دیوانە چاپکراوەکانیدا بۆ ئەوەی لێمان ڕوون و ئاشکرا بێ کە دەسەڵاتی شیعری ئەم شاعیرە گەورەیە چەند پەلی هاویشتووە چەند بڵاوبۆتەوە لە دەرخستنی جوانی بەژن و باڵای خۆشەویستەکەیدا لە تیر گرتنە سەوداسەرەکانی. لە دڵ شکاندنیدا، لەبێ ئارامیدا، لە پەژارە و غەمدا لە خوێنی سوور و لە هەنسک و سکاڵایدا لە ناهەمواریدا. لەبێ کەسیدا لەگەڵ ئەو هەموو گوزەرانە تاڵە ناخۆشەیدا. هەر بەسەودای ئازیز و خۆشەویستەکەیەوە بووە لە سووتاندا بووە تا دوا هەناسەی ماڵئاوایی کردنی لە دونیا. وە نەبێ نالی لەیەک ڕێبازی کارگوزاری شیعردا ڕێڕەوی تا دوا هەناسەی بڕیبێ بەڵکو لە هەموو ڕێڕەو و پەیڕەوێکدا مامۆستایەکی بێ هاوتای دەریایەکی گەورەی بێ پەی و بێ بنی ئەدەب بووە. لە خۆشەویستی ڕاستەقینەدا کارگوزارێکی فەرمانڕەوا بووە دڵی هەرگیزاو هەرگیز لە خوشدا بووە لەگەڵ خۆشەویستەکەی لە بێ ئارامی و ناسازیدا بووە. لە قەسیدەیەکی ترا دەڵێت:

دەستم لە گەردەنی خۆت هەڵمەگرە ئەی حەبیبە
وا بزانە خوێنی خۆمە یا منەتی ڕەقیبە
سەر بەردەبازی ڕێتە تەن تەختەی بەندی جێتە
دڵ مەیلی خاکی پێتە ڕۆح ماڵی خۆتە بیبە
... هتد

بۆ لێکدانەوەی وردەکاری ئەم قەسیدە بەرزە پێویستە بەئاگا بین:

١- لە (تەوریە) لە (خصائصەکانی شیعری عەرەبی).

٢- لە جیناس لەگەڵ (موحەسەناتی لفظی) لە هەمان پەراوێزی ئەو جۆرە شیعرانەدا. مانای قەسیدەکە: دەستم لە گەردەنی خۆت هەڵمەگرە ئەی خۆشەویستم ئەی ئەو کەسەی کە ناوت حەبیبەیە. یەکێ کە دەستی خستە گەردەنی یەکێکەوە ئەبێ بەمەبەستی، ئەبێ بەخوێنی، ئەبێ بەیەک گیان لە دوو لاشەدا تۆ وای تەماشا بکە کە خوێنی منە یا منەتی ڕەقیبە و بەکارە بەوەندی بزانە کە بەخوێن دەستم کەوتووە سەرم دەمێکە کردووە بەبەردەبازی ئەم ڕێگایەی کە پێیدا ئەڕۆی، پێی بنێ سەر و باز بدە،



بپەڕێرەوە، لەشم تەختە بەندە، لەسەری ڕابکشێ، ئارامی لەسەر بگرە، پشووی لەسەر بدە، تەختە بەندی جێگاتە، لەشم ئەکەم بەجێگای دانیشتنت. دڵم مەیلی تۆزی ڕێگات ئەکا، بەر پێت ئەکا، سەوداسەری ڕۆیشتنتە بۆ ئەوەی بەتۆزی بەری پێت چاوم گەش بکەمەوە. گیانیشم فیدای تۆیە لەمنی بسێنە من پێشکەشم کردووە بەخۆت. تۆ گوڵێکی تازە پشکوتووی ئاڵی، تۆ خونچەیەکی تازە کراوەی باخچەی جوانیت، من شێوەم ژاکاوە، من و تۆ نزیک ببینەوە لە یەکتری سوور و زەرد ئەنوێنێت. تۆ ئەو هەوایەی کە هەڵی ئەمژی ئەو هەوایەی کە ئەیدەیتەوە بریتییە لە شەماڵ منیش هاودەم و هەناسە و هەڵمژینم گڕە... چاوەکانی خۆشەویستەکەم وەکو چاوی شاهێن وایە وەکو چاوی باز وایە هەمیشە چاو خومارە، چاو کەمێ ژاکاو و سوور هەڵگەڕاوە، مەستی شەرابی نازکردنە خۆشەویست و دڵدارە، دڵ ناسکە، ئەبێ دڵی ڕابگیرێ، ئەبێ نەوازشی بۆ بکرێ دڵ ڕاکێشەرە، گیان ڕاکێشەرە، خوێن لە لەشی خۆشەویستدا بڕە، دڵ لە هۆشی هەموو کەسێ بەرە. ئەو مندالە، ئەو تازە ساڵە، کە تەمەنی لە چواردە ساڵ تێپەڕ ناکا ئەو بەچاو ئاسکە، بەڵام کە هاتە ڕاوکردن، کە هاتە نێچیر بریندار کردن وەکو شێر ئێسک تێک ئەشکێنێ، جەستە ورد ئەکا، نالی دووبارە ئەڵێم، نالی لێوی خۆشەویستەکەم گوڵە و دکتۆرە، سەرگێژکەر و تیمارە، لێوی خۆشەویستەکەم دەرد و دەرمانە، هەم دەرد ئەهێنێ و هەم دەرمان ئەکا. خولاسەی هەموو جۆرە ئازار شکاندنێکە چاک کەرەوەی نەخۆشە، لەبەر ئەوەی بەو جۆرەیە، فەرمانت پێ ئەکا فەرمانبەری لێو و قسەکردنی بکە لێوی تۆیە. بەم جۆرە ئەم شاعیرە گەورەیە لە ناخی دڵ و هەستەوە گەورەیی شیعری گەیاندۆتە لووتکە. هەر بەم جۆرە ئەبێ و وردەکاری، هوشیاری، مامۆستایی لە ئەدەب و شیعر وتندا.

***

سەردانی دیلان لە «ڤیەنا» بۆ کۆنگرەی ئاشتی جیهان ساڵی ١٩٥٤

## کولوە بەفرەکان(١)

کولوە بەفرەکان زۆر ئاهیستە و لەسەرخۆ ئەهاتنە خوارێ بەجۆرێ چرکە چرکیشی لێوە نەئەهات کە بکەوتایەتە سەر شووشە سەهۆڵەکانی قەراغ. دەمێک بوو ئاسمانم بەشینی نەدیبوو، ماوەی دە ڕۆژ بوو لە پرووشە و ئاسمانی کش و هەوری یەک ڕەنگ و یەک توێ بەولاوە هیچی ترم نەئەهاتە پێش چاو، جگە لەوەی دووکەڵی کارخانەکان توێژاڵێکی ڕەشی ئەخستە سەر شاری مەیو لەبەر بەیانا. شەوی ڕابوردووم تا بەری

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١١٨٨) ٢٥/شوباتی/١٩٥٤.

بەیانی لە (ستاتی پارک) ڕابوارد لەگەڵ نوێنەری گەنجەکانی جیهان، گەنجە ئەمریکانیەکان، سۆڤیەتیەکان، ئینگلیزەکان، ئیتالیەکان و بلغاریا. گوێم زرەنگەی نوتقە بەسۆزەکەی کچە ئەمریکاییەکەی ئەدایەوە کە وتی(گەنجی ئەمریکا ڕووی تفەنگ ناکاتە سنگی برا گەنجە سۆڤیەتیەکانی بۆ چاوی ڕەشی پیاو خۆرەکانمان). دەستم ئێستەش مێروولە ئەکا لەبەر گوشینی خۆ بەیەکناسین، چاوم ئێستەش دەربهێنرێ تومارێکی وێنەی وردی دەم بەپێکەنینە. وەک گوڵی بەر بەیانەکانی لێ چاپ ئەکرێ. ئەو دەمانە کە ئەیان وت (پەیمان ئەدەی کە بگەڕێیتەوە بەکوڵتر بۆ ئاسایش تێبکۆشی). لەپڕ دەنگێ هێنامیەوە سەرنجدان لە کولوە بەفرەکان بای نەرمیش جارجار لەیەکی ئەئالان وەک کۆمەڵە پەپوولەی بەیەکا هاتووی سەر نێرگزەکانی بەهاری کوردستان. سەرنجم دایەوە بەردەمم دار سێوەکان بڵند گۆیەکی لێ بەسترا بوو لەبن هەر دار سێوێکدا شۆخێکی باڵا چناری لەژێر وەستابوو، نیشانەیەکی شینی بەستبوو بەبازوویەوە کۆترێکی ئاسایشی لەسەر نەخشکرا بوو، لێی نووسرابوو (کۆنگرەی میللەتان لەپێناوی ئاسایشا). بەرامبەرم ڕاستە و ڕاست پەیکەری سەربازە سۆڤیەتی بێ ناوە کە چوو بوو بەگژ ئاسمانا، هەتا ئەهات خەڵک پیر و گەنج پیاو و ژن زۆر ئەبوون و وەک دەریای با فڕین بۆ قەراغ شەپۆڵیان ئەدا بەرەو ئێمە (بەرەو نوێنەرەکان). نازانم چە دەست و بردێ بوو ئەو تەختەبەندە ڕازاوەیەی بەکۆتری ئاسایش بۆ ئێمە سازکرد، هەر کەسە لە جێگەی دانراوی خۆی ئۆقرەی گرتبوو، سەرەو خوار و سەرەو ژوور تا چاو بڕی ئەکرد هەر خەڵک پاڵەپەستۆی جێگای بوو بۆ تەماشاکردن ئیتر خەڵک ئەم سەر و ئەوسەری لە وزەی چاوی منا نەما. سەعات (٣,٢٥) پاش نیوەڕۆیە، بڵندگۆکانی سەر دارسێوەکان دەستی کرد بەفڕکەی گۆرانی ئاسایشی جیهان (ملیۆنەهایە ئێمە... هتد) ئەو دەنگە خوێنی بزوانم، تاوتاویش ئەبوو خەریکی بەستنەوەی مشکیەکەم بوومایە چونکی سەربادان بەملاو بەولادا ئەیکردەوە، زیاتر لەبەر وێنەگرەکان خوم ڕێک ئەخست چونکی مەبەستیان بوو جلی کوردی بچێتە ناو نیشانگای بەرگە نەتەوایەتییەکانی جیهانەوە. بەرەو ژوور ڕوانیم، بەڕیز تیپێکی مۆسیقا لەپێش ڕیزی دەم و چاوی سوور بووەوە ئەی ژەن و ورد ورد جادەی بەرەو بەردەمی ئێمەیان ئەبڕی. شیعارێکیان هەڵگرتبوو بەپانی جادە وەک لە دواییدا زانیم لێی نووسرا بوو (بژی کۆنگرەی میللەتان لەپێناوی ئاسایشا). بەفر ورد دێتە خوارێ، بڵندگۆکان ئەنرکێنن، تەماشاچیان پەنگ ئەداتەوە، سەرەتای خۆنیشاندانیش بەرەو ئێمە ئەکشێ پێنج پێنج، دەدە، بیست بیست... هتد. قۆڵیان کردبوو بەقۆڵی یەکا هەر یەکە کۆترێکی ئاسایشی لە کاغەز دروستکراوی بەرزکردبووەوە، تەنگیان بەدەنگی



بڵندگۆکانی سەر دارسێوەکان هەڵچنی، گەیشتنە بەردەممان هەر کەسە دەستی ئەبرد کڵاوەکەی دا ئەگرت و ئەی وت: (بژی کۆنگرە). ماوەیەک درێژەی کێشا تا ئەو دەستەیە لە چاو ون بوون، دووبارە تیپێکی مۆسیقای تر لەپێش دەستەیە خەڵکی ترەوە جۆرە ئاوازێکی تری لێ ئەدا ورد بۆ بەردەممان ئەکشا، لەم کاتەدا تەقە ڕای چڵەکانین، من لە دڵی خۆما وتم ڕەنگە پۆلیس بێ بیەوێ سەر لەم خۆنیشاندانە بشێوێنێ بەڵام نازانم چۆن سەرم هەڵبڕی بۆ ئاسمان کە ڕوانیم وەک پۆلە مەل لاستیکی فووتێکراو کەوتۆتە ئاسمان هەمەڕەنگ بەرز ئەبوونەوە و لەپڕ لێک ئەبوونەوە و کۆترێکی ئاسایشی لێ ئەهاتە خوارێ بەسەر ئەم خەڵکە جۆشاوەدا هاوار لە ئێمە و هاوار لە تەماشاکەران، دەنگی بڵندگۆکان، هاواری خۆنیشاندەران، دەنگی تیپە مۆسیقاکان کولوی بەفر هەموو ئەیان وت (ئاشتی، ئاشتی). ئێستە نازانم گوێ لەچی بگرم، لە کامیان؟!. بەڵام دەنگێکی یەکگرتوو هێنامیەوە کۆڕی بیرکردنەوە لە خۆمان لە خۆمانی کورد کە بەجارێ نوێنەرەکانی وڵاتە عەرەبەکان ئەیانوت (عەرەب، عەرەب، سلام، سلام) خەڵکەکەش لەگەڵیان ئەی وت (ئەرەب، ئەرەب، سلام، سلام). بەم جۆرە دەستە دەستە، تیپ تیپ خۆنیشاندەر ئەهاتن و بەبەردەممانا تێپەڕ ئەبوون هەر دەستەیە لەگەڵ هاو چین و هاو ئیشا ڕیز بوون و یەک کەوتبوون. تەختی چاوم گیرا، بەدەورووبەرا گوێم لە وتاری مامۆستا (عبدالرحمن خمیسی) بوو کە ئەیوت: (نەتەوەی میسر پەیمان ئەدا دوورکەوێتەوە لە پڕۆژە سەربازیە دوژمنەکان). بەڵام بەڕاستی وڕ بووم، بۆچی خەڵک بەرەو ژوور مل شۆڕ ئەکەنەوە، دوور ئەڕوانن، چییە؟! وا دەستەیەکی تر و تیپێکی تر دەرکەوت بەڵام جیاواز لە دەستە و تیپەکانی تر، تەپڵ و مۆزیقەکان لە جیاتی بەقوماشی شین داپۆشرێ ئەم بەڕەش داپۆشرابوو وە جۆرە ئاوازێک لێ ئەدەن کە لە هی شیوەن ئەچێ. ورد هاتنە بەرەوە، هەمووومان سست بووین، بێ چرپە و جووڵە چاومان بڕیە، ئەم دەستەیە، سەرنجم دا یەکێ بەعەرەبانە ئەڕوا یەکێ چوونەتە بن باڵی، یەکێ دەستی پەڕیوە، یەکێ دەموچاویان بۆ کردۆتەوە، کێن ئەمانە: (تێکچووەکانی شەڕ). ئاخ، دیمەنێکی جەرگبڕ و شێوەی پڕ فرمێسک هەر یەکە کۆترێکی ئاسایشیان بەدەستەوەیە و بەنووزە ئەڵێت: (مەهێڵن ئەمجارە هێجگاری لەناوچن). ئەم دیمەنە بەمەوە نەوەستا، کە ڕوانیمان هەر ژنە منداڵی خۆی کردۆتە قەڵات دۆشکانی یا بەباوەشیەوەیە، منداڵی شەش مانگ، ساڵ، دوو ساڵ، ئەو منداڵانەی کە لە چووزەرەی گۆزەروان گەلێ نازکتر و پاراوترن، کە گەیشتنە بەردەمی ئێمە، هەموو بەیەک جووڵە منداڵەکانیان هەڵبڕی و هاواریان کرد (ئەم منداڵانەمان لە گڕی شەڕ ڕزگارکەن، ڕزگاریان کەن لە بۆمبا). نەئێمە هەستمان ما، نەتەماشاچیان، تێک ڕژاین هەر منداڵە، هەر

دایکی منالّه، هەر باوکی منالّە سا کوێی بەردەم ئەکەوت دەمی پێوە ئەنا، ئێمە فرمێسک و ئەوان فرمێسک، ئێمە گریان و ئەوان گریانە نازانم چۆن ڕوانییە بەردەمم تەماشام کرد دایکێک منالّەکەی خستۆتە باوەشی پێست ڕەشێکەوە منالّەکەشی دەمی ناوە بەلا ملی ڕەشەکەوە، بەجۆرێ هەلّی ئەمژێ گەلێ لە مەمکی دایکی پەرۆشتر، ئینجا وتم، بەلّێ، ئەئاوا ڕەش و سپی منالّی شەش مانگ دەم ئەنێ بەملی ڕەشێکەوە، بۆ؟ چونکی نابێ جیاوازی بمێنێ لە میان ڕەش و سپیدا ئەگینا چۆن منالّێکی لە پەڕەی گولّ ناسکتری بێ زیان بیری ئەوەی هەیە ئە ئاوا جیهان ئاسایشی ئەوێ بۆ مانەوەی ئینسان ئەو ئینسانەی کە سەد پشتە هەولّی بۆ پێشەوەچوون و ڕزگار بوون و ئاسایشیەتی. بەم جۆرە ئەو خۆنیشاندانەی کە لە (ڤیەنا) کرابوو لایەنگری کۆنگرە دوایی هات پاش ئەوەی نزیکەی سی سەعات درێژەی کێشا.

***

## هەڵفریواندن(١)

من خۆم کەوتوومەتە بۆشاییەوە، هاوڕێکانی جارانم لە دوولا جێی خۆیان کردۆتەوە، دەستەیەکیان کەوتوونەتە دووی (بڕوا) و جلّەو دەبەستن. دەستەکەی تریشیان کەوتوونەتە دووی (گوزەران)و جلّەو دەبەستن و بوون بەخاوەنی پایە و ڕابواردنێکی بێ گرێ لەم دنیا فراوانە پڕ لە ئاژاوەیەدا.

منی دەستم لەبنی هەمانەکەوە لە هەردوو لاوە دەرچوو، چی بکەم؟! ئایا پەتی کەشتیەکە بەرەلاّکەم بۆ گەرداو و (با) چۆنی لێ ئەخوڕێ ببیات. وە ئەم تەمەنە کورتەی ژیانم لەم بۆشاییەدا بێ پەلەقاژێ بەرمە سەر!. پێویستە لە هەردوو دەستەی هەردوو لاکەی بگەێنم من چیم! من مرۆڤێکم هەڵمەتەکاسە و بەهەڵپەم و بەدەم، پلەی خوێندەواریم ڕێم ئەدات لە چەن کۆڕێکا ڕووم بێ خۆم دەربخەم. شتێکی تریش، ئەم خەلّکە، ئەو خەلّکەی خۆمان چۆنن؟ ئەو زۆربەی کە ماوەیەکی کورتی ڕۆژگار لە لێو هەڵقورتاندن و توانج و چاو لێ زیت کردنەوەوە ئەتوانرێ بخرێتە بارێکی تر، باری زەردەخەنە و لێک نزیک بوونەوە و چاو جریواندن! ئەو زۆربەی خەلّکەی کە دوێنێی ڕەشی وەک پەردەی سینەما و کردەوەی جەرگبڕی وەک هەڵەیەک و تاوانی وەک تفەنگێکی لە دەس دەرچوو دێتە بەرچاو!!

کەواتە ئەگەر مەترسیم لە کۆنە قینی ئەو زۆربەی خەلّکە ببێ لەژێر پیکی ئەم لێ

(١) ڕۆژنامەی ژین ژمارە (١٣٧٠) ١٩٥٧/١١/٢٠ بەناوی (ژیل)ەوە.



ورد بوونەوەیەدا وردوخاش ئەبێ، جا ئیتر بۆچی لێی ڕاوەستم، پێویستە بجوولّێم، بدوێم، بسووڕێمەوە وە تێیان گەێنم. ئەم جۆرە قسانەی لەبەر خۆیەوە ئەکرد و دەستێکی نابووە ژێر لاجانگی چەپی، سەرنجێکی دایە تەپلّەکە جگەرەکەی بەردەمی کە ماوەیەک بوو جگەرەیەکی لەسەر دانابوو بۆ ئەوەی نەفەسێکی لێ بدات، جگەرەش تا ئەو پەڕی بووبوو بەخۆلّەمێش و ڕێک لە جێگای دامردبووەوە تۆزێکی نەبێ، دووکەلّی ئەو نەختەی کە مابوو ڕاست بەرەو سەرەوە ئەکشا وەک مارێک هەلّسابێتە سەر کلک، باش سەرنجی دایە دووکەلّی جگەرەکە و لەبەر خۆیەوە وتی: بڕوانە ئەو دووکەلّە لە کاتێکا (با) نەبێ ئەملاو ئەولای پێ بکا و بلاّوبکاتەوە ڕاست ئەتوانێ سەر بکەوێ، جا کەوابوو بۆچی من سەر نەکەوم بۆچی بەرز نەبمەوە لە کاتێکا هیچ جۆرە بایەکی توندوتیژ و ڕێ لێگری خەلّکی ڕووم تێ نەکات. نە بای (تۆلّە) نە بای (تەشەر) نە بای (قین) نە بای ئەنجامی کردەوەکانی پێشووم، با بکەومە گەڕ، بەلاّم چی بکەم؟ دەمەوەری و هەلّپە و قەرەچناغیم لە کوێ وا دەرخەم؟! کام نەوی نەرمانە و ڕەقەن نییە؟! بۆ چاندنی تۆوی هەلّفریواندنم؟ کام گۆم نەقوولّە و نەمەلە زانینێکی ئەوتۆی ئەوێ کە بێ هیلاکی و سەر ئێشاندن و پەل هاوێشتن مەلەیەکی ئاسانی تێدا بکەم و مەلەوانێکی شارەزا دەرچم؟ بێ گومان ئەبێ بارەکەی بدۆزمەوە.

ڕێیەک ئەگرم، نەدەستەی یەکەمی هاوڕێکانم کە ڕێی (بڕوا)یان گرتووە لایان ناشرین بێ و پێیان ئەلّێم من لەم ڕێیەوە ئەمەوێ سوود ببەخشم. سوود بۆ ئێوە و ئەوانی تریش، شتێکیش کە سوودی تێدا بوو گوناهە لەقەی لێدەی ناڕەوایە تێی سرەوێنی، تاوانە نەی گری و بەرەو پێشەوەی نەبەی! ڕێیەک ئەگرم دەستەی دووەمی هاوڕێکانیشم بەخۆیان و سەرکردەکانیانەوە لایان پەسەند بێ و بەشتێکی باشی بزانن و پێیان ئەلّێم: بۆ خەلّک دوورخستنەوە لە کەوتنە دووی (باوەڕ) شتی چاکە، لەپڕ هەلّسایە سەرپێ، هەموو جەستەی هاتە لەرزین و کەوتە لێو کرۆشتن! هەردوو دەستی نایە هەردوو لاجانگی، دانیشتەوە بێ پەروا دەستی برد بۆ جگەرەکەی بۆ ئەوەی نەفەسێکی وای لێ بدات بگاتە هەموو کون و قوژبنێکی سیە زەرد هەلّگەڕاوەکانی. بەلاّم هەموو شتێکی وەک (کوپەلّە هەنگوینەکەی کابرای دالّغە لێدەر کە بەلەپی خۆی شکانی) لە کەللە و دەمارا چووە دەرێ. بۆچی! چونکی هەردوو پەنجەی چزا بەئاگری ئەو جگەرەیەی کە مابووەوە لە تەپلّەکە جگەرەکەدا.

١٩٥٧

***

# گەرما[1]

خۆزگە دەمم ئەنا بەکونە سەهۆڵەکەی قزلەرەوە تا بەفری نوێ ئەکەوتە زەوی، خۆزگە ئەچوومە ناو ئاوەکەی کانی باجگەی سەری سەگرمە تا پایز گەڵای زەردی ئەوەران، ئاخ گەرما ، نەپانکە نە ئاورشێن، نە ، نە هیچ شتێک دادم نادات چی بکەم، بۆ کوێ بچم؟ ڕۆژێ تەوێڵـە ، دووان ئەزمـر، سیـان سەرسیر و ئەمـلاو ئەولا ئەمـەش هەر ناکرێ سێ مـانگەی هاوین لە ئیـشـەکـەم دوور کـەومـەوە لە قـرچەی نیـوەڕۆیەکـا ، ئەمـەی بەدەم ڕۆیشـتنێکی بێ شیـرازەوە، لەم بن دیوارەوە بۆ ئەو بن دیوار و ڕقیـشی جار جـار لە دیوارە گوێسوانە کورتەکـان هەڵئەسا کە سێبەرێکی کەمیـان ئەدایە خـوارەوە، ئەگەر سێبەر بکڕڕایە مەتری بەچەند دینارێک کڕیار بوو، ئارەقیش لە تەپڵی سەریەوە تا کەڵە موسـتی پێی وەک جۆگەلە سەری کـردووە تا دەستی نا بەدەرگای مـاڵەوەدا و وەک لە بارانێکی سـەر بەکـڵاوە ڕابکا خـۆی گـەیانە ژوورەکـەی، گـۆرەوی بۆ ئەمـلاو قـۆنەرە بۆ ئەولا ، چاکەت بۆ سەر ئەو دۆشەک، پانتۆڵ بۆ سەر ئەم بەرە مایەوە فانیلە و دەرپێکە، نەگەیشتبووە هەیوانەکە نەڕاندی، ئەوە چێشتەکە هێشتا پێ نەگەیشتووە؟! ئەوا مردم لە برسـا ، ئەچم بۆ دەرەوە نان ئەخـۆم، کـچێ مـردم، ئا ، ئا ، ئا بەڵام ئایا قـوش ئەتوانێ تازە ئەو جل و پێـڵاوە تەفـروتوونا کـراوە هەر یەکـە لە قـوژبنێکا کـەوتووی پێ لەبەر بکاتەوە، خێزانیشی وەکـو مـاڵێکی لە بۆردومـان ڕاکردوو چی بەوەزن سـووک و بەنرخ گران دەستکەوێ بەپەلە لە کوێ کاتەوە و دەربازبێ و کەننەڵان و شیـوڵ و چۆڵی دەوری شار بەو جۆرە فڕکەی سینی، قاپ، کەوچک، مەنجەڵ، ماسـتاو ئەم دەس بەو دەستی ئەداو لەبەردەمی (کابرامانا ) گلێر ئەکرایەوە. ئنجا وەک نەخـۆشێکی پارێز شکاو هاتە سەر خواردنەکە و ئەگەر دەمی هەر پێنج پەنجەی بگرتایە ئەی گەیانە زمانە بچکۆلەی لە تاوانا تیکە گەیشـتە نزیک بیست و سی!!، پشوویەکی ئۆخەی و قرقێنەیەکی هەشت و دە سانیـە درێژی گرتە چۆلەکەکانی سەر دار مێوەکەی بەردەمی هەیـوانەکە و چۆلەکەی دەستڕێژ لێکراویش هەر یەکە بەلایەکـا . دەک دەسـتتان شکێ ئەوە نەبوو نەختێ خوێ زیاد بـکەنە قـبـولـیـیـەکـە ، من نەم وت کلینچکە بۆ من دانێن! نەم وت، نەم وت!. وەخـتێکی زانی قـاچەکانی بـەردەمی وەک بەئاوێکی گـەرم و سـابوون شـورا بێ پاک و تەمـیـز شـتـوویەتی. فـافـۆن و چینیـەکـانی بۆ بەزم نەئەبوو ئەگـینا ئامـادەی هەڵدانی ئەوانیش بوو ئنجـا بۆ سـەر مـاسـتـاوەکـە و چۆڕی لێ بڕی! چا ، چا ، خـێـرا چایەکم بۆ تێکەن هێشـتـا دوا قـومی چاکە زمانە بچکۆلەی نەی هاوێشـتـبووە ئەودیو خۆی گەیانە

(۱) ڕۆژنامەی ژین ژمارە ( ١٤٠٠) ١٩٥٨/٧/١٧.



جێگای خەوی پاش نیوەڕۆی و ڕاست لەسەر گازی پشت بۆی ڕاکشا ، چاوی لە ورگی بوو لەگەڵ هەناسەدانا وەکو مووشەدەمە هەڵئەسا و ئەنیشتەوە، بەجۆرێ بەری بینینی پەنجەرەکەی لێ گرتبوو ، نەخێر هەمیسان مێمڵەکە، مڵۆزمەکە، ئیزرائیلەکە هاواری سـەروسنگ و پشت و ورگ و ڕانەکـانی بوو ، ئارەق هەمـیـسـان بۆ سـەر دۆشـەک و تەنینەوە، نووست بەڵام نووستنێکی وەک لە هۆش خۆچوویەکی تا لێ هاتوو. لە تەقەی پەنجەرەکە کە با دای بەیەکا وەک کێچ لە غار دەرپەڕی، بەو شێوەیە بازرەقەی بەست ئەم پەنجـەرەیە ، نە شـەقێ نە دوان، خـڕڕڕڕ...، دوو سێ تەبەق شـووشـەی لێ شکا ، دووبارە هاتەوە سەر جێگاکەی بەڵام خەو نییە! ئاخ یەک تۆز خەو بۆ خوا! ئیمڕۆ نیوڕۆ بیرەیەکم لەگەڵ نانا نەخواردەوە ئەوا خەوم لێ چووە قوڕگی شێر! ناچار لۆژ لۆژ هاتە بەر هەیوانەکە لەسـەر کورسیەکە دانیشت. ئۆف، ئۆف، گەرما ، لە چە وڵات و شارێکا لە دایک بووم! بۆ لە وڵاتێکی ساردی دوور لە گەرما لە دایک نەبووم! لە شتێ سەرنجی ڕاکێشا کە لەسەر تەپڵەکێکی لای دانرا بوو ، گۆڤارێک، بۆ محترم... فلان. بەپەنجە کـەوتە هەڵپـچڕینی و لاپەڕەکـانی هەڵپـچڕی، یەکـەم وتار بەپێنووسی فـلان، ئەوە ئەمیشمان لێ بوو بە(ڕۆسۆ) . هەتیو تۆ بۆ نایەیتەوە سەر شار چیت داوە لەم نووسین و شتە قۆڕانە ، کە فڕت بەسەر هیچ شتێکەوە نییە ئەمە چییە!

دەرەوە ئەمـانەمان لێ بوون بەمـامۆسـتا ، ئەمە هەموو زمانزانین و خوێندەواریەکەیانە ، ئاو بە (آو) ئەنووسن لە جیاتی، ئەنووسن، ئەڵێ، ئەڵێ، ئەڵێ مامۆسـتا ، هە ، هە ، تا دوێنێ بوو لەگەڵ فلانی پیسا ئەگەڕاو ئەی خواردەوە و ئەمەی ئەکرد و ئەوەی ئەکرد. ئیـمڕۆش (مـقالات)مـان بۆ ئەنووسێ! بابڕوات تاقـەتم نییـە هەمووی بخـوێنمـەوە. بۆ لاپەڕەی ئەودیو، دەفـەرمـوو لێم بـوون بە نالی و مـەولەوی و ناظم حکمت و جـواهری!! شیعرم بۆ دائەنێن! شیعر! بەخوا لە جیـاتی ئەوان ئەمڕۆ ئەم گوێرەکانە لە خۆیانەوە، شنەی شەماڵ، کزەی بای بەیان، جوانی کوردستان بەڵێ کوردایەتیم بۆ ئەکەن بەشیعر، شیـعر! بۆ ئەو دیو با گۆڤارەکـە نەکەم بەدوو پـارچەوە، چیرۆکـێکی کورت بەپێنووسی فـلان! ئەوا مـوپاسـان و گـۆرکـیمـان زیاد کـرد، ئەرێ ئەمـیـان بۆچی ناچیـتـە بۆ ئەولاو ئەمیشـیـان بۆ ئەملا چیان داوە لەسەر یەشاندنی ئەم خەڵکە! نەختێ دەستی نایە ژێر چەناگەی وتی، نەخێر هەڵە لە مانەوە نییـە لە گۆڤارەکانەوەیە هەر هەقی سووتاندنی هەیە چۆن ڕێـگا بەم مناڵ و مـەزنە ئەدات ئەم گێـرەیە لەم گۆڤارانەدا بکەن! لەپڕ چاوی گـێـژ و وێژ بوو بەو تۆزە سـەیر کـردن و بەو دوو سێ دێڕ و ناوانە ئۆف، ئەڵێم ناخـوێنمـەوە، ئای، ئای، ئای خـۆ ئەوە سەعـات پێنجە ، بەگـوژم ڕای کرد بۆ ژوورەکـە،

خێرا گۆرەوی بۆ پێ، قۆندەرە بۆ قاچ، چاکەت بۆ سەر قۆڵ، پانتۆڵ بۆ پێ، تەپ تەپ بەرەو کۆڵان دوو هەنگاو کردن بەهەنگاوێ و لەبەر خۆیەوە ئەی وت، ئەو تۆزە تەماشا کردنی گۆڤارە (پیسە) (موعد)ەکەی لەبیر بردمەوە! خۆ من ئەم ئێوارەیە لە سەعات پێنجەوە ئەبوو لەسەرچنار بوومایە و دەعوەتی خواردنەوەی ئەمشەوم لەسەر فلانە!!.

١٩٥٨

***

# ئەو گوڵەم بدەرێ(١)

چیرۆک- ١٩٧٩

دوو چاو، لە دوورەوە تێی ئەڕوانیم و نەئەتروکا، برژانگ سەرەو خوار نەئەکرا، دەم نووقابوو، گوێ نەئەدرایە بەرپێی چی لەبەر شەقاودا بێ، شانی لێ بدرایە، شانی لێ بدرایە، شانی بدا لە خەڵک، قۆڵی بەردەس بکەوتایە، دەستی بەر قۆڵ بکەوتایە ئەیڕوانی، تێر ئەیڕوانی، بێ گرێ، بێ تروکاندن ئەیڕوانی، هاوڕێکەی کە لەگەڵمدا ورد پیاسەی ئەکرد، سەری لێ شێوا، لەپێشا ئەو سەرنجە ورد و درێژەی لا سەیر بوو، نەیئەزانی ئەگیرێتە کێ؟ ئاوڕی دوای خۆی دایەوە، یەکێکی وای نەبینی جێی ئەو سەرنجە بێ تەماشای بەردەمی خۆی کرد لەپێشەوە چەند کەسێکی ساکاری دی جێی ئەوە نەبوو ئەو سەرنجەی تێبگیرێ. سەرنجەکە تیژتر بوو، بێ گوێدانە خاوەن سەرنج ورد بێ تروکاندنی چاو هات، هات پێش ئەوەی بگاتە ڕاستم قووڵتر ڕوانییە هەردوو چاوم، کە خەریک بوو بگاتە لاشانم، دڵۆپێکی گەورەی بڵاوبووەوە بەناو چاوەکانیا ئەم سەر و ئەو سەری چاو، گێژ و کەژاڵە پاکە پڕ لە بەزەییەی گرتەوە، کە لێم تێپەڕ بوو، پاش ڕۆیشتنێکی بێ ئاگایی لە خۆم و لەوەی لەگەڵمایە و لەوەی لەبەر دەممایە. هاوڕێکەم وتی: ئەرێ ئەوە کێ بوو؟ وردەیەک هاتمەوە هۆش خۆم، هاوڕێکەم، با زوو بگەینە دەرمانخانەکەی ئەوبەر پشوویەک بدە و تێم بگەیەنە!. تێم گەیێنە تۆی چاو هەڵگڵۆفراوی کز بینین مل و شان بارکێشی مەینەتی دوور و درێژ زۆربەی ساڵانی لاویت لەناو دیواردا ڕابوارد و، ڕیشەکێشی نەبوونی، هەندێ جار هەموو کەسێ نزیکت و کەسوکارت هەندێ جار زۆر بەلێت دوورە پەرێز، تۆی چەقی ئاوەسوو پەراسوو، پەراسوو شکاو، ڕووت، پێ هەڵخلیسکاو، نەک جارێ، چەن جارێ هیچ بەهیچ نەکردوو، لە بارەی سامانی دنیاوە، هیچ بۆ خۆ نەکردوو لە بارەی دنیای ئەولاوە، تۆی

(١) گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ساڵی ١٩٧٩.



تەزیوی ساردی ژیان، ڕەهەندەی کۆسپ و چیا و ئاوی سوور و سوێری ئەم وڵاتە، تۆی زەرد هەندێ جار، ڕەش هەندێ جار، لەبەر چاوی خەڵک، تۆی گەورە، زیرەک، خوێندەوار، ڕۆشنبیر، لە کاتی نەختێ سەر گەرم بوونا، تۆی هیچ، هیچ، هیچ، لە کاتی هیچیی ئەوانا، تێم گەیێنە، تکات لێ ئەکەم تێم گەیێنە، تۆو سەرنجی قووڵی چاوێکی پڕ لە فرمێسکی کەژاڵیی، کراوەی بێ درۆی بێ هەڵخەڵەتاندنی خۆ بەگوناهکار و گوناهبار زانیوو بەرامبەرت. تێم گەیێنە، لەم شەقامە پانەدا، لەناو ئەم هەموو خەڵکە جۆر بەجۆرەدا تۆی لەرزۆکی ژیانی جووڵە و بزووتن، بێ هەناوی باوەش کردنەوە، بێ دەنگی ڕێگاگر بەرەو لە گۆکەوتن، تۆی کەنارگر، لا، دووری تێکەڵاوی، پڕوکاوی تەکانی گەرمای سەرکەوتن. پێ لە خرتکە چووی سەر بەرەو خواری، نیشان لێ دیار نەبووی پانی و بەرینی. تێم گەیێنە ئەو دوو لێوە نووقاوە دوور لە پشکوتنەی نەفرەت لە ژیان کەرەی تا تۆ نەدیوو. لە هەموو شتێ هەڵقورتاو، تا ئەم سەر و چاوە ژاکاوە تەپیوە نەدیوو، چی بوو؟ ڕاست بوو؟ بەڕاستی بوو؟ تۆی مەبەست بوو؟ تۆی گرتەوە؟ تۆی باربوو کرد؟ چی بوو، تکات لێ ئەکەم تێم گەیێنە چییە؟ وتم، ورد گوێ ڕاگرە، بەمەرجێ تا لێ نەبمەوە هیچ پێم نەبڕی، نەپرسیاری ئەی بۆچی واو ئەوە بۆ وام لێ ئەکەی! ڕام مەکێشە بۆ هیچ پرسیارێک، بۆ وای نەکرد بۆ وات نەکرد، بۆ وایان نەکرد؟ گوێ ڕاگرە، وتی فەرموو:

ساڵ بەهارە، گەرمەی گەشانەوەیە، چوالە گوڵی سووراو کراوە، گۆیژە، قەیفەیەکی سەوزی پۆشیوە، بنار زەردی گوڵە بەیبوون و نێرگە دەغل نوقمی خەرتەلەی زەردە گردۆڵکەکان، سووری گوڵاڵەن، چرۆی ئەرخەوانی تازە پێشکووتوو تازە کراوە، ڕاکێشەری هەزارەها هەنگی لێ وڕوکاوە، بەرەو خوار بڕوانێت، بەرەو تانجەڕۆ تا چاو بڕکات سەوزە، هەموو شتێ پێ ئەکەنێ، ئاسمان شینە، تاکە تاکە پەڵە هەورێکی سپی سەر دارمازەڵە و پیرەمەگروونی گرتووە. هەوری سەر قەیوان تۆخ دڵی پار دیارە، وردە وردە لەسەرخۆ لە ماڵ هاتمە دەرەوە. ئەوسا سەرم ڕەش بوو، چاوم کراوە و بریقەدار بوو، ڕۆینم بەپای ئارەزوو بوو، دڵم کراوەی لاوی بوو، تەنم گوڕی لێ هەڵئەقولا، ماوەی چەند ساڵێ بوو هەوڵم دابوو بنجێ گوڵی گوڵە باخی ئاڵم دەست کەوتبوو ڕوانیبووم یەکەم خونچەی کە کرایەوە پچڕیم و گرتم بەدەستەوە، پێویست بەدرێژە ناکات لەسەرخۆ بەپەنجەکانی دەستی چەپم ئەم دیو ئەو دیوم پێ ئەکرد، تەماشای جوانی گوڵەکەم ئەکرد، لەپڕ، بەڵێ لەپڕ، دەنگێکی سەیری خۆشی تەزوو بەلەشاهێنەر، دەمار ڕاچڵەکێنەری فریشتەیی وتی (ئەو گوڵەم بدەرێ) کە تێم ڕوانی چی ببینم، لە دەست و پەنجەوە ئەو دیوی دیار، ڕووناکی فرێدەر خڕ خەپان، ئەموست درێژ لەسەرخۆ ڕوانیم بەرەو ژوورتر

برد، دووباره ڕوانینم گێڕایەوە بۆ تێر تەماشاکردنی، ئەمەوێ لە سەیری ئەو دەست و پەنجانە تێربم، هەتا دێت جوانتر و گەشەدارتر و مەشخەڵ فرێ دەرتر ئەنوێنێ تەماشا کردنم بەپەلە لە گرێی پەنجەکانەوە سەرخست بۆ ژوورتر، ژێر چەناگە، ترنجێکی بێ گرێی کۆڵ ژێر لێو نەختێ چاڵ، دەم، چی بڵێم، خونچەی گوڵە هەنارێکی بەئاستەم درز تێ بوو، لووت گوڵێکی ڕێ کەوتوو لەگەڵ دەمە نووقاوە هەزار داستان لێ دروست کراوەکەیدا، ئینجا بۆ لەناو دەریای مەنگی کەژاڵ. چە چاوێ، هەموو گێتی لەناویا تواوە، هەموو چیاکانی دەور و پشت ڕەنگ لێ نیشتوو، پرچ ئاڵۆزێکی کەمێ گرژ، برۆ جووت دەستکاری نەکراو ڕێک نەخراو، کەم و زۆر نەکراو، بەکورتی وشک بووم، دەستە لەرزۆکەکەمم لەسەرخۆ بۆ هەڵبڕی، گوڵە پچڕێنراوەکەی کە بریتی بوو لە دڵۆپی خوێنم نەخشێنراو دامە دەستی، گیان و هەست و هەناسەم هەموو شتێکم پێوەدایە ئەو پەنجە هەموو دنیا هێنەرەی لای هەتا ئێستام. بەلێوە خوێن تێزاوەکەی فەرمووی، سوپاس، تا دەرگاکەی پێوەدا سێ چوار جار ئاوڕی دایەوە، من وشک وەستاو، خەڵک دێت و ئەڕوات و ئەمبینێ. ئەو ئاوڕم لێ ئەداتەوە، ئەوی تریان تریسکە ئەبەستێ، جووت ئەبن و ئەوانیش تێکەڵ ئەم گێژە هەموو ئەندام هێنەرە هەڵپەرکێیە ئەبن، نازانم، نازانم. چەن دەقیقەیەک، چەن ساتێک تێپەڕبوو چی بکەم بگەڕێمەوە، بۆ دووبارەکردنەوەی سەرلەنوێ ڕێگای ئەوبەر دەرگا گرتنەم، نەگەڕێمەوە، ئارامم نییە، پرسیارم لی ئەکەن نازانم ئەڵێن چی!! نازانن چی وەڵام ئەدەمەوە، هەموو شتێکم لا ون بوو، بەهاری چی؟ پەڵەی گوڵاڵەی سووری چی! فەرشی سەوزە گیای کەناری چی؟ خوێندنی هۆزار و مەلە دەنگخۆشەکان، هەموو شتێ (بەهارە جوانیی بەهار، دەنگخۆشی، سامان، بۆ ئەو یەک شت نەبێ) یەک شت نەبێ، نیشتمان، ئەم وشەیە نیشتمان لەپێشا ڕای چڵەکاندم، لەپاشا ورد ورد وەستاندمی، هەڵسڵەمیمەوە، خۆم بەخۆم گوت، بڵێی وەک من وشەی نیشتمان لەو پەڕی ئاسۆی بەرزی ئاوات و ئارەزووەوە سووکێ هێنامیەوە، ئەویش هەر هیچ نەبێ کەمەکێ وشەی نیشتمان، کاری تێ کردبێ!! وەک چۆن وشەی نیشتمان هێنامیەوە، پێی وتم، وەرەوە، وەرەوە، وەرەوە، لەپڕ، بیری کەوتبێتەوە، خۆی سڵەماندبێتەوە، باشتر وایە خۆم تاقی کەمەوە بڕیارم دا نووسراوێکی بچووکی بۆ بنووسم و بۆی بنێرم، چی ئەبێ، خۆ دنیا ژێر و زەبەر نابێ، خۆ هیچ نەبێ لە دەروونی ئەویش ئەگەم و نووسیم! خۆشەویستم نازانم چۆن دەس پێ بکەم. بەپرس، بەتکا، بەپاڕانەوە بەلاڵانەوە بەکڕنۆش، بەلەرزۆکی یا وەکو کوردێک باشتر وایە وەکو ڕۆڵەیەکی ئەم نیشتمانە خێر لەخۆ نەدیوە، خوێن پیا هەڵپژاوە، دەم تێ ژەنراوە، کۆت کراوە، کە چەن سەدەیەکە خەڵکەکەی تێ هەڵئەچێ ڕائەپەڕێ، پەنگ



ئەخواتەوە، تەکان ئەدا، سەر و چاوی تەپ و دووکەڵاوی ئەبێ خوێن بەهەموو پەل و هەنگاوێکیا دێتە خوارەوە و ئەگاتە ئەوەی بڵێ (ئۆخەی) لەپڕ دەستە ئەژنۆ، پەراسوو تێک شکاو، لانە لێ شێواو، پەرەوازە و تاکو لۆ ناوچەوان لۆچاوی، نینۆک هەڵکێشراو، یەخە دادڕاو پێ لە خرتکە چوو، لەڕ، لاواز، بێ تین، لاکە لەسەر و هەموو ئەندامییەوە هاتوو، شپرزە، تاڵاو چێژ، کەمەر تێ سرەوێنراو ڕووەو ڕۆژی لە ڕۆژهەڵاتەوە هەڵهاتوو، چاوە نەرمە خەوی شەو بێداری تێشکاوەکەی نەرم ئەترووکێنێ، لەژێر لێوەوە، ئەڵێ ئەم جارەش خەو بوو بەڵێ، ئەم جارەش خەو بوو وەکو جارەکانی تر، بەڵام ئەی خۆشەویستم ئاوات خۆی چییە؟ هەناسە هەڵکێشانە و بەس کە نەهاتە دی؟ نەخۆش کەوتنێکە و مردن کە نەهاتە دی! یا دووبارە خۆ گرتنەوەیە، خۆ خەریک کردنەوەیە، خۆ هاوێشتنە کوڕەوەیە بۆ تین پەیدا کردن و جموجۆڵ بۆ لە هەتاوی مانگی نیسانی بەهار گەیاندن کە پێست پێویستی بەهەتاوە. بۆ پنگر بوونەوە و ئەستوور بوون بۆ ئەوەی چنگ و نینۆک کار تێ نەکراوتر بێ، تکات لێ ئەکەم، وەڵامێکی دەس و بردم بدەرەوە! یەکەم: وتەکان ئەسەلمێنێ یان نا؟ دووەم: یەکترمان خۆش ئەوێ یان نا؟ چاوەڕێی وەڵامم. چەند ڕۆژێکی بەسەردا تێپەڕبوو، وەڵامم وەرنەگرتەوە، دەستم کرد بەهاتوچۆ، بەخێرایی ڕۆیشتن، لەپڕ ڕۆیشتن خاوکردنەوە، سەراسیمە لەم سووچ و لەو سەرەڕێ لەو کۆڵان، نەبوو، نەبوو، خۆمم بەخۆمم وت بڵێی نووسراوەکەم دەس کەس کەوتبی، نەیگەیێنێ کەسوکاریکی پێی زانیبێ! لەپاشا خۆم وەڵامی خۆمم ئەدایەوە، یا دیبێتیان، خۆ کفرم نەکردووە، خۆ هەڵەم نەکردووە، خۆ قسەی بێ جێم نەکردووە، خۆ قسەی توێکڵدارم نەکردووە، چیم وتووە ڕاستە و ئامادەم دووبارەی کەمەوە، ئارامم لێ بڕا، خواردنم کەمی کرد، لۆچی خەفەت کەوتە ڕووم، زەردی شێوەی دەم و چاومی گرت، بڵێی بەهەڵە نەچووبم، بڵێی (ئەو گوڵەم بدەرێ)یەی ئەو هەر شتێکی ساکاری ڕێکەوت بووبێ، دووبارە وەڵامم ئەدایەوە، خۆم ئەموت، بۆچی چاو ئەخوێنرێتەوە یا ئەندامی تر؟! من ئەزانم چاوی وتی چی و چیش ئەڵێ، با دووبارە خۆم تاقی بکەمەوە و نووسیم: خۆشەویستم، ماوەیەکی کەم ڕۆیی بەسەر نووسراوی یەکەممدا، بەماوە، بەڵام بەلای منەوە تەمەنێکە، نازانم ئایا نامەی پێش ئەمەت بەدەست کەوتووە یان نا؟ پێش ئەوەی دەس تۆ بکەوێ دەس کەسی تر کەوتووە یان نا؟ ئەگەر لەو باوەڕەدای وەڵام دانەوەت وا نابی وەکو من مەبەستمە، وەکو من بەتەمام، وەکو من گیرۆدەم، ئەوە هی خۆتە، خۆ گەر وای لێک ئەدەیتەوە کە نووسراوەکەت بگیرێتە شووشە و هەڵواسرێ وەکو وێنەیەکی ژیانم کە رتووش و دەسکاری نەکرابێ، ئەوەش هەر هی خۆتە خۆ ئەگەر وای لێک ئەدەیتەوە وەڵامەکەت

ناچارم بکا چاو بگەیەنم بەدەس، دەس بگەیەنم بەیەک و دڵۆپی فرمێسکی دەس بەیەک گەیشتن لە هەردوو چاومان بێتە خوارەوە و زەویی بەردەمی ژیانمانی پێ بنەخشێ، بۆچی وەڵامم نادەیتەوە؟ چونکە با پێت بڵێیم ئەوەی کە لە نووسراوی پێشوودا بۆم نووسیت دووبارەی ئەکەمەوە من (کوردم)، یەکێکم لە ئازار چێشتوەکانی ئەم شارە شیرینە، شێوە بەهاری جوان، وەرزی وڵاتەکەم، ئەوەندە تێگەێنە خۆ نووسراوی یەکەممت پێ گەیشتووە یان نا؟ سوپاس. هەمدیسان کەوتمەوە سەر هێنان و سەر بردن، هەمدیسان کەوتمەوە هاتوچۆی ناو ژوور، وەرە چی بکەم، چی نەکەم؟

بڵێی نووسراوەکەمی وەرگرتبێ؟ وەڵامی دابێتەوە و بەیەکێکا ناردبێتی و نەگەیشبێتە دەس من؟ بڵێی؟ نەنووسراوی نووسیبێ و نووسراوەکەی منیشی دڕی بێ؟ بڵێی لە ترسا لەناوی بردبێ لە تاو دەوروپشتی، ئەی بڵێی ئەمە هەمووی لێکدانەوە و پەشێوی و بێ ئاگایی و بێ دەرفەت چارەمانی خۆم بێ خۆم و ڕووت؟ چی بکەم؟ بۆ کوێ بچم؟ خۆم لەبەر خۆمەوە ئەم وت: بنووسەرەوە، نووسراوێکی تر، بنووسە، بنووسە، سێ بارە نووسیم. خۆشەویستەکەم، ئارام لەبەر بڕەکەم، مێشک و بیر تێکدەرەکەم، خەو لێ هەراسان خۆشەویستەکەم، خۆراک لێ تاڵ کەرەکەم، یەک شت ماوە لێم تێکدەی، لێم بگری ئەویش هەوایە، یاخود هەناسە وەرگرتنە! ئەگەر بێت و تێنەگەم ئەو دوو نووسراوەی کە یەک لە دوای یەک بۆم نووسیت، پێت گەییووە یان نا؟ بەرچاوت کەوتووە یان نا؟ خوێندووتەوە یان نا؟ ئەوا ئاسمانی ژیانی لێ ورووژاوم ڕەش هەڵئەگیرسێنێ، تکام وایە، سێ بارە تکام وایە تێم بگەیەنی، نووسراوەکانم، سووتێنراوە! پارچە پارچە کراوە خراوەتە ژێر گڵەوە؟ شاردراوەتەوە؟ چییان لێ هاتووە؟ هەمدیسان تکات لێ ئەکەم تێم بگەیەنە، خۆ ئەگەر... خەریک بووم وشەی دوایی خۆ ئەگەر بنووسم لە دەرگای حەوشێ درا! چوونە ناو کاغەز نووسینەکە وای لێ کردبووم زۆر گوێ نەدەمە لە دەرگادان، خەریک بووم بنووسم و دووبارە لە دەرگا درا، کاغەز و پێنووسم واز لێ هێنا، سووکێ هەستام، وردە وردە ڕۆیشتم بەرەو دەرگا کردنەوە دەستم دایە دەرگا و کردمەوە و خستمە سەر پشت چیم دی؟ ئافرەتێکی خۆ پێچەرەوە بەعەبا و پەچەیەکی ئەوتۆوە کە بەهیچ جۆرێ شێوەی دەم و چاوی ژێر پەچەی دیار نەبوو، سەرم سووڕما وتم، فەرموو، چیت ئەوێ؟ ماڵی کێت ئەوێ؟ بێ ئەوەی سرپەی لێوە بێ سووک خۆی کرد بەژوورا، بۆ حەوشە، بە دوو سێ هەنگاو ڕووی کردە ئەو ژوورەی کە نووسراوی سێهەمم لێ ئەنووسی. نەختێ لە هەیوانی بەردەمی ژوورەکەدا خۆم لێ خلافان و لە دڵی خۆما وتم، کێ بێ؟ چی بوێ؟ بۆچی هاتبێ؟ چۆن وابێ ورتە لێوەهاتن خۆی کرد بەژوورا و یەکسەر بۆ ژووری کاغەز لێ نووسینەکە، نەختێکی تر



وەستام و لەسەرخۆ چووم بەرامبەری دانیشتم. سەرم هەڵبڕی وتم، خۆش هاتی، وەڵام نەبوو، دووبارە وتمەوە بەخێربێی، سووکێ لێوێکی لەرزۆکی بزوان، بەئاستەم هاتە گوێم وتی: سوپاس! ئەم دەنگە سەیرە! تۆزێ چاوم بڕیە بەردەمی خۆم، دووبارە سەرم هەڵبڕیەوە، وتم، فەرموو. فەرمانت چییە؟ بۆچی هاتووی؟ هەمدیسان نەختێ وەستام و وەڵام نەبوو! نەبوو، ئەوەندەی تر سەرم سوڕما، سووکێ دەستم برد بۆ کاغەز و پێنووسەکە، بەدەست و پەنجەیەکی کار تێکراوەوە ڕێکم خستن، لاپەڕەکانم ڕێکخستەوە و ڕووم کردە نیگارە ڕەشەکەی بەرامبەرم لە تەپڵێ سەریەوە لەسەرخۆ دەستم کرد بەتەماشاکردنی بۆ دەم و چاوی ژێر پەچە و بۆ سنگ و بەرۆکی داخراو و تا نووکی پێی هیچ شتێکی ئەوتۆم دەس نەکەوت کە بەڵگەبێ بۆ نەختێ ناسین! ماوەیەک تەماشاکردنی ئەم دیمەنە ڕەشە، سەیرە، ئەم ئەندامە خۆ پێچراوانەم کرد بێ ئەوەی بتوانم لە هیچ بگەم، دەستم برد بۆ گوێچکەکەم، لەبەر خۆمەوە وتم، باشتر وایە بچم دەرگای حەوشەکە دابخەم نەک لە ناکاو یەکێ، کەسوکارێ، برادەرێ خۆی بکا بەژوورا بێ ئاگا لێ بوونم و ڕاست بێتە ئەم ژوورە، تەکانم دایە خۆم هەڵسم، ڕەشپۆشی بەرامبەرم، وتی، مەچۆ. دەنگێکی سەیرتر وشک بووم و ئەڕوانمە ئەم دیمەنە سەیرە، چاو ناتروکێنم، دەس نابزوێنم ورتەم لێوە نایەت، کەوتمە دەریایەکی سەیرەوە، ڕاستت ئەوێ نەم ئەزانی چی بکەم، چاوم داخستەوە، دووبارە ڕوانیمە بەر پێی هەردووکمان، خشپەی شتێ سووک هاتە بەرگوێم، وردێ سەرم هەڵبڕی، چیم بەر چاو بکەوێ؟ یەکەم جار؟! چی ببینم؟ یەک دوو پەنجەم دی خەریک بوو پەچەکەی تەواو لە دەم و چاو لا ئەدا.

نەختێکی تر وێرام سەیرتر کەم، لێو و دەمێکم دی، لێدانی دڵ گەیشتە سەر سەد! زووتر پێڵووم بەرزترکردەوە دوو چاوم دی، هەموو ئەندامم بەڵێ هەموو ئەندامم هاتە جووڵە و پێستم دەستی کرد بەزەرد هەڵگەڕان خەریک بووم پڕ بەدەم و قوڕگ هاوارکەم، زانی خەریکم، نەختێ لەجێی خۆی جووڵا و چار شێوە و عەباکەی لە خۆی کردەوە و گرمۆڵەی کرد و خستییە سەر کورسییەکەی تەنیشت خۆی و وتی! دوو سێ ڕۆژە لە لێکدانەوە دام کە وەڵامی نووسراوەکانت بدەمەوە. یان نا؟! خۆم بیهێنم و بیدەمە دەستت، ئەویشم لا پەسەن نەبوو، ئەم دوو سێ ڕۆژە سەرهێنان و سەربردنە وای لێ کردم و بڕیاری تەواوم دا خۆم بێم و چی لە دڵمایە بۆتی هەڵڕێژم. وتەکانی لەو دوو لێوە یاقووتییە ئەباری هەموو ئەندامی ئەوی کردبوو بەگوڵ، هەموو ئەندامی منیشی کردبوو بەگوێ! بەڵێ هەموو ڕەگ و دەمار و خوێنم گوێ بوو بێ ئەوەی بەخوێن وتەکانی هەڵمژم نەک بەهەناسە تێکەڵ بێ بەگیانم بۆ ئەوەی ئەگەر هات و لەبەر چاویشم ون بوو وتەکانی لە هەموو ئەندامەکانما بمێنێتەوە و تین بدات بەساڵەهای ژیانی لەوە دوام، لەوە

پاشم، وتم باشە ئەی ئەم ماوەیە کە زیاترە لە چەن ڕۆژێ هۆی نەهاتنت وەکو ئێستا هاتی چی بوو؟ وتی: وەکو کەوتبوویتە گۆمەوە کە لە نووسراوەکانتا بەدی ئەکرا منیش هەموو هەست و نەستم لای خۆم نەمابوو، منیش وەکو خۆم لەگەڵ خۆما... ڕاوێژکەر بووم، درێژە نەدەمێ، کە من تۆ بەخۆشەویستی ڕاستەقینەی لە دڵەوە هەڵقوڵاوی خۆم ئەزانم، پێویست ناکا لەسەری بڕۆی، با ئیتر درێژەی نەدەینێ، چیت ئامادە کردووە بۆ ئەمجارە چونکە ئەو چەن پارچانەی کە لە ڕۆژنامەی (...) خوێندمەوە شتێکی لێ تێگەیشتم کە هەڵبەست و نووسینەکانت دوو جۆرە مانای هەیە:

یەکێکیان (نیشتمان) و خۆشەویست کردنی نیشتمان، دووەمیان مەبەستت (منە)، هەر چەندە هەموو خوێندەوارێک وەکو من لێکی ناداتەوە، هەر سادە و ڕووت بۆی ئەڕۆن بەڵام من لای دووەمیش لێک ئەدەمەوە، ئەزانم ئەڵێی چی!! لە مەبەستت ئەگەم و ئەشخوازم درێژە بەنووسین و هەڵبەستەکانت بدەیت چونکو مەبەستی دووەمیشیان هەر گەشەپێدانی زمان و نووسینی کوردییە ئەو چەن ساتەی پێکەوە دانیشتین، بەڕاستی نازانم چەن بوو، بەڵام بەلای منەوە وەکو چەن دەقیقەیەک وا بوو، ئاواتەخواز بووم ڕۆژی ئەو ڕۆژە زۆر درێژتر بوایە، ئەوەندەی پێ نەچوو وتی، درەنگە با بڕۆم، ئیمڕۆ بەسە تا چەند ڕۆژێکی تر بەیەک ئەگەینەوە، تا دەرگای حەوشێ لە گەڵیا چووم و دەستم خستە ناو دەستی، کە مەگەر خۆم و خۆی بزانین ئەو دەست خستنە ناو دەستە چی گەیان. بڕوات وا بێ کاکی برا ئێستاش گەرمیی نازکیی، نەرمی، کارەبای دەست و پەنجەکانی لەگیانما هەر گەشە ئەکا، ناڕواتە دەرێ تا ژێر گڵ خوشەویستیی ڕاستەقینەی بێ گرێ نزیک و دوور، ڕۆژ، مانگ بەمانگ لە بڵێسە سەندندابوو، خۆشەویستی ئێمەی بێ گرێ، بێ گرێی شارێکی وەکو ئەم شارە بەقسەیە، بەتوانجەی هەندێ، بەرزمە لێ هەڵساندنەی تاقمێ، بەپارە پەرستنەوەی دەستەیە، بەشەرەف و دڵسووتاو و ڕاست و ڕاستڕۆیی زۆربەی، بەڵێ خۆشەویستی دڵ و گیان بیر و لێکدانەوە و هەنگاوی پڕ لە تێکۆشان بۆ چارەسەرکردنی نەتەوە نەمردووە، ڕیشەکێش نەکراوە، جیڕ و هەڵمەت بەرەکەمان لە کونجێکی وڵاتەکەیەوە داماڵراو لەلایەکی ترەوە دووبارە کردنەوەی کۆشش بۆ گەیینە ئامانجە پیرۆزەکانی، خۆشەویستیمان تا ئەهات بەرەو گەشەسەندن و داچەسپاندن ئەڕۆیشت. چەن جارێ یەکتریمان تاقی کردەوە، دوا بڕیار هاتینە سەر ئەوەی ڕێگا خۆش کەین بۆ ئاشکرا کردن پاش هەڵسەنگاندنێکی تەواو، بۆ بوون بەهاوبەشی ژیان. لە یەکتری بینینەوەکاندا گەیشتینە ئەو بڕیارە کە ئەگەر تەگەرە و گرێیەکیش بێتە ڕێ گوێ نەدەینێ و بەسەریا باز بدەین. شەوی نەورۆزی ساڵی تێپەڕ بووەمان دانا بۆ خوازبێنی ئاشکرا.



ئێوارێی ئاگری نەورۆز کردنەوە ڕوانیمە چیاکان لە هەموو لووتکەیەکەوە کڵپە و بڵێسەی ئاگری بوو، ڕووم کردە ڕۆژهەڵات، ڕوانیمە زەردەی ژوور کەل، ڕووم کردەوە ڕۆژئاوا بوون، لە تەمەنما وەهام نەدیبوو، بریتی بوو لە کۆمەڵە پشکۆیەکی یاقووتی شێوە، سەیرم هاتە بەرچاو کۆمەڵە پشکۆیەکی یاقووتی شێوە، سەیرم هاتە بەرچاو کۆمەڵە ئاگرێکی سوور، بەرامبەری وەستام، ڕۆژ لە ئاوابوونا و منیش ڕاچڵەکیم لە دڵی خۆما وتم، شەوێ خوازبێنی نەورۆز، ڕۆژ پشکۆیەکی درەوشەداری خوێن لێ باریو. لە ئاوابوونا سوور. ڕۆژئاوا بوو و نەبوو، دەوروپشتی ماڵەوەمان جووڵەیەکی شێوە سامناکی سەیری تێ کەوت خەڵکی ناسیاو و نەناسیاو تیژ خێرا ئەڕۆن و خۆیان ئەگەێننە ماڵەوە لەلام سەیر بوو، پێش ئەوەی بگەمە ماڵ و دەرکی ماڵەوە بکەمەوە و دەستم برد بۆ دەرگا، یەکێ لە دواوە وتی، بوەستە، دەنگەکە سەیر بوو لام، وەستام سووک ئاوڕم دایەوە. یەک دوو، سێ، چوار، پێنج زیاتر لە دە ژاندارمم دی بەچەکەوە و یەکێ لەپێشیانەوە وتیان خۆت لێرە لەگەڵ یەک دووانێکا بوەستە و سەرکەوتنە سەربان و دەستیان کرد بەپشکنینی ماڵ، ئەم ژوور ئەو ژوور، ئەم پەنا ئەو قوژبن، ماوەیەکی خایان وتیان پێشمان کەوە، وتم بۆ کوێ؟! وتیان ورتەت لێوە نەیەت تۆ گیرایت. ئەو شەوەم چۆن لێ ڕۆی، نازانم چی بنووسم، نازانم چی بڵێم، لە خوازبێنی کردنی ئاشکراو گەشانەوە و شیرینی دابەشکردنی خێزانی و خۆیەتیەوە بۆ ژووری زیندان، لە شەوی ئاگر لەسەر هەموو بەرزیەکی شاخەکانی دەوروپشتەوە بۆ ژێر زنجیر لەناو پەڵەیە نێرگسەوە بۆ ژووری دڕک، لە پشکوتنی بەهارەوە بۆ چاڵی هەتاو لێ شاردنەوە، لە پەنجە لەناو پەنجە خستنی ژیانیەوە بۆ دەسگرتن بەشیشی ئاسنی دەرگاکانەوە. لە بیرکردنەوەیەکی هەموو سووچێکی ژیان لێ گەشاوە بۆ پیش خواردنەوەیەکی بێ سنوور، ئەو شەوەم نازانم چۆن لێ ڕۆیی، ئەوەندەم دێتەوە یاد کە خەوی پچڕپچڕ و لە خەو ڕاپەڕین نە جارێ نە دوو فیکە لە خەو ڕاپەڕاندن و تل و ئەم دیو و ئەو دیوکردن، سەرت نەیەشێنم شەو بۆ ڕۆژ، ڕۆژ بۆ شەو و بۆ هەفتە و بۆ مانگ.

ڕۆژێکی خۆشە، هەتاوە و لە کاتی دەی بەیانیەوە کەسوکار بینینە. لەگەڵ هاوڕێکانمانا، خۆمان ئامادەکرد و لە ژوور چووینە دەرێ ڕووەو حەوشە گەورەکەی زیندان کشاین، پەنا دیوارێکم لەو پەڕی دوور لە خەڵکەوە گرت و دەستەئەژنۆ دەستم کرد بەچاو گێڕان. بڵێی بێت، بیبینم، بڵێی چاوم پێی بکەوێ، کەوتبوومە گۆمی لێکدانەوە. هوروژمی چاو پێکەوتنی کەسوکار و ناسیاو و دۆست حەوشە پڕ بوو، دیار نەبوو، کەوتمە گفتۆگۆ لەگەڵ کەسوکاردا، فڵان چۆنە؟ فیسار لە چیایە؟ ئەوەی هاتبوو بۆ لام سەری هێنامە پێشێ، وتی ئێستە دێ، بڕوات هەبێ ڕەنگم هێنا و ڕەنگم برد،

گەشامەوە، سووری ڕووی کردە شێوەم بزە کەوتە لێوم ڕووەو دەرگا ڕوانیم دیم لەگەڵ یەکێ لە دەستە خوشکەکانی کشا، هات پێش ئەوەی بگاتە ڕاستم چۆنت دی ماوەیە لەمەوبەر لەوبەرەوە کە تووشمان هات فرمێسک گەیشتبووە سەر هەردوو گۆنای، هەستام گرم دەستم گوشی، گوتم، ئۆخەی ڕەوانەکرام، دیمیتەوە، دانیشتین جارێ بەدڵخۆشی دانەوە، جارێ هەناسە هەڵکێشان، جارێ بەخۆ جیرکردنەوە، جارێ بەخۆ هاوێشتنە ناو دەریای ڕێکەوتەوە و دوا دەس گوشینمان بەم وشانە لە یەکترازان، ژیان بۆ نەتەوەکەمان. گەڕاینەوە ژوورێ، ڕاست لەسەر جێگاکەم لێی کەوتم لەپەو ڕوو، هاوڕێ گیراوکەی تەنیشتم وتی کاکە، کاکە، هەڵناسی؟! خۆ تۆ نانی نیوەڕۆت نەخواردووە، بەئاستەم بزووتم و ڕاست بوومەوە، هاوڕێکەم وتی، دەموچاوت تەواو نییە، دەستی هێنا بۆ دەستم، وتی: بەخوا کەمێ گەرمی، ئەوەندەم ئاگا لە خۆم بوو، کاتێ چاوم کردەوە لە خەستەخانەی تایبەتی بەزیندان کەوتووم، شکی گرانەتام لێ ئەکرێ، نازانم ئەو چەن ڕۆژەی خەستەخانەیەم چۆن لێ ڕۆیی، کە گێڕامیانەوە بۆ زیندان پاش پانزە ڕۆژ بوو بووم بەپێستێکی لەسەر ئێسک، زەرد، گێژ، لەش داماڵراو چاو بەقوولاچوو، هاڕە لە کەللەی سەرمەوە ئەهات، هیچم پێ نەخورا، چاوم ڕەشکەوپێشکەی ئەکرد، وردە وردە پارێز و دەرمان و دەرزی، نەختێ خۆم گرتەوە.

شەوێک زوو خەوم لێ کەوت، قووڵ چووبوومە ناو خەوەکەوە، لە دەنگی گرمە و دەنگە دەنگ و هەرا ڕاپەڕیم، وتم چییە؟ وتیان خۆت کۆکەرەوە، بۆ؟ ڕەوانە ئەکرێن. بەپەلە سا هەر چۆنێ بوو خۆمان کۆکردەوە و دەم و چاو تەڕ کرا نەکرا، خێرا، خێرا، وەختێ خۆمان دیەوە لە شار دەرچووین و ڕووەو دوورکەوتنەوە ملی ڕێگایان پێ گرتووین. ساڵێکی ڕەبەق بەسەر ئەم ڕەوانەکردنەدا ڕۆیی.

چۆن ڕابوێرراو چۆن گوزەران کرا نایەتە قەڵەم، نایەتە نووسین، نایەتە گێڕانەوە، ئەوەندە هەیە، وڵاتم لا خۆشەویستتر بوو، خەڵکەکەیم لا بەڕێزتر بوو، کەوتمە بیرکردنەوە لە چیاکان لە زستانا، بەفر، کلیلەی بەفر، چاورەی درێژی گوێسە بانەکان بەستەڵەک و هەڵخلیسکاندنی، لرفە، گوێ ئاگردان، کوورە داخستن، خۆشی خۆشیمە هەفتەیەکی کە ماوەم تەواو ئەکەم ڕووەو شارە جوانکیلە، بەرەو ڕۆژەکەم ئەگەڕێمەوە، سەرلەبەیانی ڕۆژێکی بەهاری نەختێ پیربووی گوڵە بەیبوونی سەربانەکانی خانووە پێشینەکانی شارەکە مل لەقێنەر بوون بەدەم شەماڵی ئەو ڕۆژەوە. نەمڕوانییە ئەم لاو ئەولا تا گەیمە بەردەرگای ماڵەوە، پاش پشوودان لەسەر کورسی ژوورەکەم ڕووم کردە خوشکە (...) وتم، ئەوان کوان؟ لە کوێن؟ کەس دیارنییە! مانای چی! وتی گەڕەک و خزمان



هەموویان خۆیان ئامادە کردووە شەو دێن بۆ لات، وتم ئەی ئەو! سەری داخست، وتم توانای دەرد هەڵگرتن و خەفتبار کردنی ترم نییە. کاسم ئێستە. دانیشتم، وتی: بێ ئەوەی سەر هەڵبڕی چەن ڕۆژێک ئەبێ و دەستی کرد بەگریان، گریا، گریا. کوڵم هەڵسا، خەریک بووم بدەمە پڕمە، خۆم ڕاگرت و دانم گرت بەخۆما. وتم: توخوا، تێم بگەیێنە چییە؟! مردووە؟!

پڕمەی زیاتر بەر بووەوە، وتی، نا نەمردووە، وتم ئەی چی وتی شووی کرد، وتم باشە چۆن؟ چۆن؟ چۆن؟...

وتی کەسوکاری پێیان لێ کردە کەوش و ناچاریان کرد و بڕیانە مێشکیەوە کە تۆ جارێکی تر ناگەڕێیتەوە و بەرنابیت و ناگەی بەگوڵی بەهارا.

ئەمەی بۆم گێڕایتەوە بۆ نزیک، نزیک بیست ساڵێکە ئەوسا ئەمە نەبووم کە ئێستا ئەمبینی، ئەوسا سەرم، ماش و برنج نەبوو بوو وەکو ئێستا لۆچ لە دەموچاوما پەیدا نەبووبوو بینین کز نەبوو لۆچ نەکەوتبووە پێش چاو و پێستی ڕوومەتم. وازم لێ بێنە، ئەها، لەو بەرەوە وەستاوە، باش نایەتە بەرچاوم، شتێک شێوە ئەکەم، ئێستێ خۆم وا ئەبینم، وام لەسەر چیایەک، تا چاو بڕکات ڕێچکە ئاو و دار و سەوزە گیایە، چیا دوورەکانی کە لە چیاکە، خۆم لە پەنا بەردێک هەڵخستووە سەر و چاوم تەم گرتوو لێ دیارە، لووتکە دوورەکانم تەماوی دێتە بەرچاو، وەکو لەسەر ئەو چیایەوە بڕوانمە بەردەمێکی دوور وا دێتە بەرچاوم، ئەو پەڕینەوەی کە ئەوی لێ وەستاوە و چاوەڕێیە، پۆلیسی ڕێگا ڕێی بدات لەگەڵ ئەو خەڵکە بپەڕێتەوە. باش نایەتە بەرچاوم، چاوم بڕی ناگاتێ هەناسەم خەریکە سوار ئەبێ. دەستم بەرەو شل بوون ئەڕوات، زمانم لە ڕۆژی یەکەمی نەخۆشیەکەم گیرانی زیاتر لێ پەیدابووە، دەستی ڕاستم قورسە، بەرەو قورستر بوون ئەڕوات، ئاخ، ئەوا پەڕیەوە ڕووی کردەوە ئەمبەر وا دیارە، ڕوو ئەکاتەوە بەر دەمم، بۆ دواجار چاو پێکەوتن، بۆ دواجار چاپ بوونی وێنەی لەناو گلێنەکانما، سەرم لە جاران زیاتر گرانترە لە یەکەم بینینی ئەم ڕۆژە، تا ئێستا هەست ناکەم بتوانم، هێز بدەمە خۆم و ڕاست بوومەوە. ئاخ توانای بینینیشم کەمتر بوو، پێش ئەوەی بگاتەوە ئەمبەر و بێتە بەردەمم، تکات لێ ئەکەم دەستێ بخەرە سەرشانی چەپم توانای خۆ گرتنم نەماوە بەسەر کورسییەکەوە! ئەمەوێ یارمەتیم بدەی لە لەش گرتنا و تا تێپەڕ ئەبێ، ئەوا نزیک بووەوە! خەریکە ئەگاتەوە ئەمبەر، ئێستا وا لە بەرامبەرم، توخوا، توندتر شانم بگرە با ئەم دیمەنە ڕاستییەی نەخەیاڵە نەچیرۆک نەبرێتە ژێر گڵ.

# ناوەڕۆک